ئادەم گیونەش

# هەنگاو بەهەنگاو
# پەروەردەی
# سێکسی
# منداڵ





# هەنگاو بە هەنگاو
# پەروەردەی سێکسی
# منداڵ

# دەستپێك



چەند ساڵێک بەر لە ئێستا، کتێبێکم بە ناوی (پەروەردەی مەحرەمیەت/ The Education of Privacy) نووسی. لەو کتێبەدا، باسمان لە چۆنێتیی دروستبوونی هەستی مەحرەمیەت[1] لای منداڵ کردبوو و ئەوەشمان ڕوون کردبووەوە کە چۆن جەستەی خۆی بپارێزێت، هاوکات جیاوازیی نێوان (پەروەردەی مەحرەمیەت) و (پەروەردەی سێکسی)شمان خستبووە ڕوو.

بەڵام لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا، هەستم کرد دایکان و باوکان پێویستییەکی زۆریان بە ڕێبەرێک هەیە پرسە سێکسیەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە، چونکە کاتێک پەروەردەی سێکسی بەگوێرەی بنەماکانی مەحرەمیەت ناخرێتە ڕوو، کۆمەڵە گرفتێک سەر هەڵدەدەن کە چارەسەرکردنیان ئەستەمە.

دەسا چیمان بکردایە؟ پەروەردەیەکی سێکسی تەندروست دەبوو بە چ شێوەیەک بووایە؟

هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانە، ئەم بەرهەمەی بەردەستی خوێنەری لێکەوتەوە...

---

(١) مەحرەمیەت، بە واتای خصوصیەت یان تایبەتمەندی کەسی دێت. بریتییە لە دروستبوونی هۆشیاری لای تاک -بەتایبەت منداڵ- سەبارەت بەوەی جەستە و بوون و هەستەکانی موڵکی تایبەتی خۆیەتی و بۆ هیچ کەس نییە بێ مۆڵەتی خۆی دەستیان بۆ بەرێت، یاخود سنوورەکانیان ببەزێنێت.

لەم کتێبەدا، هەستاوین بە خستنەڕووی تەواوی ئەو پرسیارانەی دایکان و باوکان و پەروەرشیاران پێویستیانە بپرسن. لە ناو سنوورەکانی پەروەردەی مەحرەمیەتیشدا، بەدوای وەڵامەکانیاندا گەڕاوین...

وشەکانمان بە هەستیاری و وردبینیەوە هەڵبژاردووە، تاکو خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەیدا هەست بە شەرم نەکات و لە جێبەجێکردنیشیدا شەرمەزار نەبێت...

خۆزگە لە سەردەمی ئێمەشدا ئەم جۆرە کتێبانە بەردەست بوونایە!

هیوادارم جێی ڕەزامەندی بەڕێزتان بێت...

> پەروەردەی سێکسی، پەروەردەیەکی تاکەکەسییە لە نێوان کەسێکی پێگەیشتوو و منداڵدا، کە تایبەتە بە بەڕێوەبردنی قۆناغی گەشەی سێکسی.

کۆتا هەستیش کە منداڵ پێی ئاشنا دەبێت، هەستی (سێکسی)یە. لە ڕاستیدا منداڵ هیچ ئەزموونێکی نییە سەبارەت بە ئاڕاستەکردنی ئەم هەستەی کە لەگەڵ پێنانە ناو قۆناغی پێگەیشتنەوە هەستی پێ دەکات. بۆیە دیسانەوە ئەرک دەکەوێتەوە سەرشانی دایک و باوک، لەو ڕووەوە کە هاوکاری منداڵەکەیان بن تا بتوانێت بە شێوەیەکی تەندروست ئەم هەستەی ئاڕاستە بکات. ئەم هاوکارییەش جاری وایە لە ڕێگەی هۆشیارکردنەوەوە دەبێت، جاری واشە لە ڕێگەی گواستنەوەی ئەزموونی دایک و باوک سەبارەت بە شێوازی ئاڕاستەکردنی هەستەکان.

ئیتر بەم شێوەیە، هۆشیاریی پەروەردەیی سەبارەت بە چۆنێتیی ئاڕاستەکردن و کۆنترۆڵکردنی هەستەکان؛ هەر لە یەکەم هەستەوە کە منداڵ دەیچێژێت (دڵەڕاوکەی جیابوونەوە)، تاوەکو سەرهەڵدانی هەستی سێکسی، بریتییە لە (پەروەردەی مەحرەمیەت). هەرچی ئەو بەشەی ناو پەروەردەی مەحرەمیەتیشە کە تایبەتە بە شێوازی ئاڕاستەکردنی هەستە سێکسییەکان و ئاگاداربوونەوە لێیان، دەچێتە خانەی (پەروەردەی سێکسی)ەوە.

پێشکەشکردنی پەروەردەی سێکسی بە شێوازێکی گونجاو، دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری و ڕۆشنبیریی تاک.

ئامانجی پەروەردەی سێکسی، گەیاندنی ئەو زانیارییە سێکسییانەیە کە منداڵ پێویستی پێیانە بە شێوەیەکی گونجاو. لە بەرامبەردا، پەروەردەی مەحرەمیەت مامەڵە لەگەڵ هەستەکانی منداڵدا دەکات.

# ئایا جیاوازی لە نێوان (پەروەردەی سێکسی)و (پەروەردەی مەحرەمیەت)دا هەیە؟

بێگومان بەڵێ.

پەروەردەی مەحرەمیەت، بریتییە لە پەروەردەی (بەڕێوەبردنی هەستەکان) یارمەتیدانی منداڵە، لە ئاڕاستەکردن و بەڕێوەبردنی هەموو ئەو جۆرە هەستە جیاوازانەی کە لە سەرەتای تەمەنیەوە پێیان ئاشنا دەبێت.

یەکەم هەستیش کە دەبێت مرۆڤ ئاڕاستەی بکات، بریتییە لە (دڵەڕاوکەی جیابوونەوە). منداڵ لە یەکەم ڕۆژەوە کە دێتە دونیاوە، جۆرێک لە دڵەڕاوکەی بەرامبەر جیابوونەوە بۆ دروست دەبێت. دڵەڕاوکەی جیابوونەوە، هەستێک نییە بتوانیت بەئاسانی لە منداڵدا کۆنترۆڵی بکەیت. جیابوونەوە لە دایک، جیابوونەوە لەو شتانەی بە هی خۆییان دەزانێت، جیابوونەوە لەو کەشەی دڵنیاییبەخشەی کە تێیدایەتی، هەموو ئەمانە سەرچاوەی دڵەڕاوکەن بۆ منداڵ.

منداڵ توانای ئەوەی نییە، بەتەنیا خۆی مامەڵە لەگەڵ ئەم هەستەدا بکات.

لێرەدا ڕۆڵی دایک و باوک دێتە کایەوە، کە ئەویش یارمەتیدانی منداڵە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەم هەستە و هاوشێوەکانی کۆنترۆڵ بکات.

بۆ نموونە؛ منداڵ پێویستی بە دڵنیاییە، بۆ ئەوەی بتوانێت لە بەرامبەر جیابوونەوەدا دڵەڕاوکەکەی کۆنترۆڵ بکات. مامەڵەی دڵنیاییبەخشی دایک و باوک لەو کاتەدا کە منداڵ هەست بە دڵەڕاوکەی جیابوونەوە دەکات، یەکەم هەنگاوی پەروەردەی مەحرەمیەتە.

پەروەردەی مەحرەمیەت دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ خۆی بپارێزێت و کەسێتیی خۆی بنیات بنێت. لە بەرامبەردا، پەروەردەی سێکسی کار لە سەر دروستکردنی ڕۆشنبیرییەک دەکات کە منداڵ پێویستیەتی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەندروست قۆناغی گەشەی سێکسی تێبپەڕێنێت.

**منداڵ لە چوارچێوەی سنوورەکانی پەروەردەی مەحرەمیەتدا، فێری ئەوە دەبێت هەستە سێکسییەکانی کۆنترۆڵ بکات.**

**ئایا دەکرێت پەروەردەی سێکسی لە دەرەوەی پەروەردەی مەحرەمیەت پێشکەش بکرێت؟**

نەخێر.

مامەڵەکردن لەگەڵ پەروەردەی سێکسی لە دەرەوەی پەروەردەی مەحرەمیەتدا، ئەگەری زۆرە زیان بە دونیای هەستەکانی منداڵ بگەیەنێت.

بۆ نموونە؛ کۆکردنەوەی منداڵان لە پۆلێکدا و ڕۆشنکردنەوەیان سەبارەت بە بابەتە سێکسییەکان، ڕەنگە بۆ هەندێکیان کێشە نەبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەندێکی تریان تووشی دڵەڕاوکە دەکات، تەنانەت لە هەندێکیاندا ڕێ خۆشدەکات بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵە هەستێک کە پێشتر لێی بێخەبەر بوون.

بۆیە زانیاریپێدانی گشتی و باسکردنی بابەتە سێکسییەکان بەکۆمەڵ، شێوازێکی تەبا نییە لەگەڵ پەروەردەی مەحرەمیەتدا.

**پەروەردەی سێکسی بەکۆمەڵ هەستی حەیای منداڵ زامدار دەکات.**

شێوازی دروستی پەروەردەی سێکسی ئەوەیە، لە نێوان دایک/باوک و منداڵدا بێت و بابەتە تایبەتەکان و چۆنێتیی کۆنترۆڵکردنی هەستەکان لەخۆ بگرێت.

## ئایا تا چەند دروستە، منداڵ لەگەڵ دایک و باوکی خۆی بشوات؟

لە هیچ تەمەنێکدا نابێت منداڵ بەڕووتی لەگەڵ دایک و باوکیدا خۆی بشوات.

تا تەمەنی (٤)ساڵی ئاساییە منداڵ بەڕووتی لەلایەن دایک و باوکیەوە بشۆردرێت، بەڵام هەرگیز نابێت دایک و باوک لای منداڵەکانیان بەڕووتی خۆیان بشۆن.

وا باشە هەموو کاتێک هەمان کەس هەستێت بە شوشتنی منداڵ. لە حاڵەتی ناچاریشدا دەکرێت یەکێکی تر ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

لەدوای تەمەنی (٤) ساڵییش، بە مەبەستی فێرکردنی پارێزراوی و تایبەتمەندیی ئەندامی زاووزێ، وا گونجاوە منداڵ بە شۆرتەوە بشۆردرێت.

هەر لە تەمەنی چوار ساڵیشەوە، پێویستە دەرفەتی ئەوەی پێ بدرێت خۆی خۆی بشوات. دایکان و باوکان دەتوانن وەک چاودێر بمێننەوە و تەنیا لە کاتی پێویستیدا یارمەتییان بدەن.

> **دەبێت لە دوای تەمەنی (٤) ساڵییەوە، دەرفەتی ئەوە بدرێت بە منداڵ کە خۆی لە تەوالێتدا پاکژیی خۆی ڕابگرێت.**

لە پاش تەمەنی (٧) ساڵیش، دەبێت گەیشتبێتە ئاستێک خۆی بتوانێت خۆی بشوات، چونکە ئەم خاڵە لە ڕووانگەی گەشەی کەسێتی و گەشەی ناسنامەی سێکسیشەوە تا بڵێی گرنگە.

## ئایا دروستە منداڵ لەگەڵ براکەی/خوشکەکەی پێکەوە خۆیان بشۆن؟

تا تەمەنی (٤)،ساڵی گرفتێک لەوەدا نییە برا و برا، یان خوشک و خوشک پێکەوە خۆیان بشۆن.

لە دوای تەمەنی (٤)ساڵییشەوە، پێویستە بەجیا خۆیان بشۆن. لە هەمان کاتدا، ئەمە هەستی سەربەخۆیی منداڵیش بەهێز دەکات.

ئەو منداڵە دووانانەش کە لە هەمان ڕەگەز نین، تا تەمەنی (٢) ساڵی ئاساییە پێکەوە بچنە گەرماو. لەو تەمەنەش بەدواوە، دەبێت بەجیا جیا خۆیان بشۆن. دووانەکان با لە هەمان ڕەگەزیش بن، دەبێت دوای تەمەنی (٤) ساڵی کاتی خۆشتنەکانیان جیا بکەنەوە.

تا تەمەنی (٧) ساڵی، خوشک و برا دەتوانن پێکەوە لە بانیۆیەکدا یاری بکەن، بە مەرجێک شۆرتیان لەپێدا بێت.

زۆر جار دایکان و باوکان وا گومان دەکەن کە (منداڵەکانیان مولْکی خۆیانە) و خۆیان چۆن ئارەزوویان لێ بێت، بەو شێوەیە مامەڵەیان پێوە دەکەن، بێ ئەوەی ڕەچاوی جیاوازی لە نێوان تەمەن و ڕەگەزیاندا بکەن. وا دەزانن مافی ئەوەیان هەیە هەر کات پێیان خۆش بوو، بیانبەنە گەرماو و بە ئارەزووی خۆیان دەست بدەن لە ئەندامەکانیانەوە و جلیان لەبەر دابکەنن.

**لە دوای تەمەنی (٤) ساڵییەوە، پێویستە منداڵ لەگەڵ خوشک و براکانیدا خۆی نەشوات.**

## پاککردنەوەی ئەندامی زاووزێی منداڵ لە لایەن دایک و باوکەوە، تا تەمەنی چەندساڵی دروستە؟

منداڵ تا تەمەنی (٣) ساڵی، لەو ئاستەدا نییە خۆی بتوانێت پاکژیی خۆی ڕابگرێت.

بۆیە تا تەمەنی (٣) ساڵی، دایک یان باوک (یەکێکیان) بەو کارە هەڵدەستن. ئەگەر ئەو کەسە دایک بێت، کارەکە ئاسانتر دەبێت، چونکە هەر لە ساتەوەختی هاتنەدونیاوە هەر ئەو ژێری پاک کردووەتەوە و گۆڕیویەتی، هاوکات ئەمە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی (هاوبەندیی متمانەبەخشیی) نێوان دایک و منداڵ.

ئەگەر دایک نەیتوانی بەو کارە هەستێت، لەو حاڵەتەدا کەسێکی تر دەتوانێت بێتە جێگەی، بە مەرجێک ئەو کەسە زووزوو نەگۆڕێت، چونکە دەستلێدانی بەردەوامی کەسانێکی جیاواز لەو شوێنانە، زیان بە هەستیاریی منداڵ دەگەیەنێت لە ڕووانگەی پەروەردەی مەحرەمیەت و پەروەردەی سێکسیشەوە.

> **پەروەردەی سێکسی بەکۆمەڵ هەستی حەیای منداڵ زامدار دەکات.**

پێویستە لە دوای تەمەنی (٤) ساڵییەوە، هەنگاوبەهەنگاو منداڵ فێر بکەین چۆن خۆی پاک بکاتەوە و بەرپرسیاری لاشەی بگرێتە ئەستۆ، چونکە ئیتر تا ڕادەیەک دەتوانێت پاکژیی خۆی ڕابگرێت.

منداڵ هەرچەندێکیش خۆی هەستێت بە پاککردنەوەی خۆی، هێشتا ناتوانێت بەتەواوەتی ئەنجامی بدات، چونکە لە تەمەنێکدا نییە خاوێنیی ڕاستەقینە دەستەبەر بکات. بۆیە دوای ئەوەی منداڵ خۆی پاک دەکاتەوە، پێویستە دایک و باوکیش دەستێکی پێدا بێنن.

لە پەروەردەیەکی سێکسی تەندروستدا، چاوەڕێی ئەوە لە منداڵ دەکەین لە تەمەنی (٦) ساڵییەوە ئیتر خۆی ئەندامی زاوزێی پاک بکاتەوە، واتە دەبێت ئەو ئەرکە بەتەواوەتی بخرێتە ئەستۆی خۆی. لەوەبەدوا، خۆهەڵقورتاندنی دەرەکی زیان لە گەشەی کەسێتی دەدات.

> **لە تەمەنی (٦) ساڵییەوە، ئیتر دەبێت پاککردنەوەی کۆئەندامی دەرهاویشتن بخرێتە ئەستۆی منداڵ خۆیەوە.**

دەبێت وریا بین لە پاککردنەوەی ئەندامی زاوزێدا، بەرهەمی سروشتی بەکار بهێنین و خۆمان بەدوور بگرین لەو بەرهەمانەی ماددەی کیمیاییان تێدایە یان ئەوانەی پێیان دەوترێت کلێنسی تەڕ. پێش تەمەنی (٤)ساڵی، کاتێک دایک منداڵەکەی بە ئاو و کلێنس پاک دەکاتەوە، پێویستە لەگەڵیشیدا بۆی باس بکات. دوای تەمەنی (٤)ساڵییش، دەتوانێت لە سەر بووکەڵەیەک پڕۆسەی خۆپاککردنەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە. فێرکردنی کۆمەڵە هەنگاوێکی تەکنیکیی هاوشێوەی: درێژیی ئەو پارچە کلێنسەی بەکاری دەهێنێت، چۆنێتیی قەدکردن و خستنە ناو تەنەکەی خۆڵەوە، ئەوەش کە کچان لە پێشەوە بۆ دواوە تارەت دەگرن و کوڕانیش لە دواوە بۆ پێشەوە، بایەخی خۆیان هەیە؛ چ لە ڕوانگەی خاوێنییەوە بێت یان پێدەگۆژییەوە[1] بێت.

> **بەردەوامیی دایک و باوک لە پاککردنەوەی منداڵ دوای تەمەنی (٦) ساڵی، زیاندانە لە کەسێتیی منداڵ.**

منداڵ چەندە ئەو کارانە بکات کە لەگەڵ تەمەنەکەیدا دەگونجێن، ئەوەندە هەست بە متمانە و گەشەی کەسێتیی خۆی دەکات.

---

(١) پێدەگۆژی (pedagogy): زانستی پەروەدە، پەروەردەزانی

## ئایا هیچ گرفتێك لەوەدا هەیە، منداڵ دایك و باوكی یان خوشك و براكانی لە تەواڵێتدا ببینێت؟

بەڵێ.

هەندێک لە سەرچاوە پەروەردەییەکان، ڕێنمایی دایکان و باوکان دەکەن کە خۆیان بە شێوەیەکی کرداری چۆنێتیی تەوالێتکردن نیشانی منداڵەکانیان بدەن.

بەشێکی دیکەی دایکان و باوکانیش زۆر ئاساییە بە لایانەوە لە بەرچاوی منداڵەکەیان تەوالێت بکەن، چونکە پێیان وایە هێشتا فامیان نەکردووەتەوە، کەچی لە ڕاستیدا هەدووکیان بەهەڵەدا چوون.

منداڵ لە هیچ کام لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا، نابێت چاوی بە دایک و باوکی بکەوێت کاتێک لە تەوالێتدان.

لە سەرەتاکانی منداڵیدا کە منداڵ دەبینێت دایکی دەچێت بۆ تەوالێت و خۆیشی بەتەنیا لە دەرەوە دەمێنێتەوە، دڵەڕاوکە دایدەگرێت. جا بۆیە لەبری ئەوەی زۆری لێ بکەین و بیخەینە گریان، دەتوانرێت لە ژێر دەرگاکەوە بەهۆی قردێلە یان پەتێکەوە پەیوەندی لە نێوان دایک و منداڵەکەدا دروست بکرێت. کاتێك دایک پەتەکە ڕادەکێشێت و بوونی خۆی دووپات دەکاتەوە، دڵەڕاوکەی منداڵەکە کەم دەبێتەوە.



**نابێت منداڵ لە هیچ کام لە قۆناغەکانی گەشەیدا، دایک و باوکی ببینێت تەواڵێت دەکەن.**



ئەوەش بە شێوازێکی دروست دانانرێت، منداڵ بە تەماشاکردنی خوشک و براکانی فێری تەوالێتکردن ببێت. باشترین شێوازی کرداری؛ بەکارهێنانی بووکەڵەیە.

**ئایا ئەو کەموکورتییانەی دێنە ڕێی پەروەردەی تەوالێت، هیچ کاریگەرییەکی نەرێنییان دەبێت لە سەر گەشەی سێکسی؟**

دەتوانین بڵێین تا ئەو کاتەی ڕاهێنان لە سەر تەوالێت نەبێت بە هۆکارێک بۆ سەرکوتکردنی دەروونی، هیچ کاریگەرییەکی خراپی نابێت لە سەر گەشەی سێکسی.

هەندێک جار پەروەردەی تەوالێت بە یەک قۆناغ جێی خۆی ناگرێت، لەوانەیە لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر تەگەرەی تێ بکەوێت. لەو جۆرە حاڵەتانەدا، هیچ پێویست ناکات خۆمان سەغڵەت بکەین. ڕەنگە وا باش بێت وچانێک بدەین، کەی هەستمان کرد منداڵەکە ئامادەیی تێدایە، ئەوکات دەست پێ بکەینەوە.

پەروەردەی تەوالێت لە سەردەمێکدا دەست پێ دەکات کە هێشتا منداڵ کارایی سێکسیی نییە، بۆیە خەمی ئەوەتان نەبێت کار بکاتە سەر گەشەکردنی لایەنی سێکسی.

ئاشکرایە پەروەردەی تەوالێت، زانیاری و ئارامگریی دەوێت. زۆربەی دایکان و باوکان لەم قۆناغەدا مەینەتیی باش دەچێژن، گرنگ ئەوەیە بێزاریی خۆمان لە سەر شێوەی فشار و توندوتیژی بە ڕۆڵەکانمان خاڵی نەکەینەوە.

سەرباری ئەمانە، ئەگەری ئەوە هەیە لایەنە نەرێنییەکانی ئەم قۆناغە، شوێنەواری دەروونیی خراپ دوای خۆیان جێ بهێڵن.

کاتێک بەو منداڵەی خۆی تەڕ دەکات دەڵێی: "ئەم جارە میز بکەیت بەخۆتا،

> **پەیوەندیی ڕاستەوخۆ نییە لە نێوان گەشەی سێکسیی منداڵ و پەروەردەی تەوالێتدا.**

گونەکەت دەبڕم"، هیچ دوور نییە ئەوە ببێتە گرفتێکی دەروونی بۆی. هەر گرفتێکی دەروونییش چارەسەر نەکرێت، گرفتی دیکەی لێ دەکەوێتەوە، لەوانەیە گرفتە سێکسییەکانیش یەکێک بن لەوانە.

## ئایا دەستلێخستن و هەڵگلۆفینی ئەندامی زاووزێی منداڵ لە کاتی خاوێنکردنەوەیدا، کارێکی دروستە؟

تا بۆمان بکرێت، وا باشە لە پاککردنەوەی ئەو شوێنانەدا هەستیار بین. بەکارهێنانی ئاوی بەرووژم یان هەڵگلۆفین، شێوازی هەڵەی پاککردنەوەن.

لە دوای مەلەکردن یان چوونە ناو ئاوی چەم و دەریاچەوە، پێویستە بە ئاوی پاک خۆمان بشۆین، چونکە ڕێژەی ئەو خوێ و بەکتریایەی لەخۆیان گرتووە، دەبنە هۆی هەستیاری ئەو ئەندامانە. هەروەها لەو شوێنانەش کە بۆ بەکارهێنانی گشتی کراوەن، وەک ساونا و گەرماوەکان، پێویستە بایەخی زیاتر بە پاکژی بدرێت. ئەمە جگە لەوەی باش نییە ئەو شوێنانە بەتەڕی بمێننەوە، یان لە کاتی شتنیاندا فشاریان بخەینە سەر، چونکە ئێمە دەزانین لە هەندێ حاڵەتدا -با زۆر کەمیش بێت- دەستلێخستنی ئەو ئەندامانە دەبنە مایەی خۆشحاڵی لای منداڵ. لێرەدا هیچ جۆرە چێژێکی سێکسی لەئارادا نییە، تەنها حاڵەتێکی کەیفبەخشە، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە لە سەری بەردەوام بێت.

**کاتێک منداڵ دەشۆین، دروست نییە زووزوو دەست بۆ ئەندامی زاووزێی بەرین.**

دەتوانین لە تەمەنی (٣) ساڵییەوە، منداڵەکانمان فێری شێوازی تارەتگرتن و پاکژکردنەوەی ئەو ئەندامانە بکەین، بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کە خۆی دەتوانێت بەجوانی ئەنجامی بدات، دایە گیان و بابە گیان با هەر بەردەوام بن.

بەتایبەت لە کچاندا دەستلێخستن و بەکارهێنانی سابوونی زۆر، دەبێتە هۆی زیاندان لەو مادده پارێزەرە سروشتییەی (flora) لەو شوێنەدایە، کە ڕەنگە دوا جار سەر بکێشێت بۆ هەوکردن.

بەکارهێنانی ئاو بەبێ دەستلێخستن و هەڵگلۆفین، سەروزیادە بۆ ڕاگرتنی خاوێنیی ئەو شوێنە.

## ئایا دروستە بە بەرچاوی خوشك و براكانیەوە، داییی منداڵ بگۆڕدرێت؟

گۆڕینی داییی ئەو خوشک و برایانەی کە لە هەمان ڕەگەزن، بە بەرچاوی یەکترەوە ئاساییە.

بەڵام هەستکردن بە جیاوازیی ڕەگەز لای منداڵ لە هەر تەمەنێکدا سەری هەڵدا، دەبێت لەو تەمەنەوە ئەندامی زاووزێی یەکتر نەبینن.

هەندێک پێیان وایە ئەگەر خوشک و برا ئەندامەکانی یەکتر ببینن، ئیدی پەرۆشییان بۆی نامێنێت. ئاخر پەرۆشی و تاسەی منداڵ، کەی هەستێکە بە یەک جار بینین بڕەوێتەوە!.

**منداڵ لە هەر تەمەنێکدا بێت، دروست نییە ئەندامی زاووزێی ئەو خوشک/برایەی ببینێت کە لە ڕەگەزی بەرامبەرە.**

منداڵ کە دەبینێت خوشکەکەی/براکەی ئەندامی زاووزێی جیاوازتری هەیە لە خۆی، ئیتر کۆمەڵێک قاڵبی ڕەوشتیی لا دروست دەبێت. لەوانەیە هەوڵ بدات دەستی لێ بدات یان لە نزیکەوە تەماشای بکات، کە ئەمانەش بۆخۆیان کۆمەڵە ڕەفتارێکی بێزارکەرن.

لەم ڕووەوە دەڵێین: ئەگەر خوشک و برا لە منداڵیدا ئەندامەکانی یەکتری نەبینن، ئەوکات ئەو پەرۆشی و حەزی بینینەشیان لا دروست نابێت.

گرفتێک لەوەدا نییە برا براکەی/خوشک خوشکەکەی ببینێت -نەک سەیری بکات- کە دایکی داییبیەکەی دەگۆڕێت، بەڵام لە حاڵەتێکدا کە منداڵ خۆی پیس کردبوو، دەبێت ئەوە بە براکەی/خوشکەکەی بوترێت، ئەوە شتێک نییە شایانی سەیرکردن بێت.



**لە ڕووانگەی پەروەردەی مەحرەمیەتەوە، وا پەسەندە منداڵ بەتەنیا بێت کاتێك داییبیەکەی دەگۆڕدرێت.**



کە دایک و باوک بەم کارەش هەڵدەستن، نابێت بە جۆرێک ڕەفتار بکەن وەک ئەوەی کارێکی نهێنی ئەنجام دەدەن یان بیانەوێت شتێک بشارنەوە، بەڵکو ئەوەندە بەسە بە شێوەیەکی سروشتی بچنە ژوورێکی ترەوە و لەوێ داییبی منداڵەکەیان بگۆڕن.

بەپێچەوانەوە، منداڵەکەی تریان حەز دەکات بزانێت چی دەگوزەرێت.



**لە کاتی داییبی گۆڕیندا دەبێت بە جۆرێک ڕەفتار بکەین، منداڵەکانی تر وا نەزانن شتێکیان لێ دەشارینەوە.**



بۆ نموونە؛ لەوانەیە هەوڵ بدات پانتۆڵی براکەی/خوشکەکەی دابکەنێت، تا بزانێت چی لەگۆڕێدایە.

دوای تەمەنی (٢)ساڵی، دروست نییە خوشک و برا داییبی گۆڕینی یەکتری ببینن، چونکە لە ڕووانگەی پەروەردەی مەحرەمیەت و چەسپینی بنەمای (سنوورە کەسییەکانەوە) پەسەند نییە.

## کاتێك دایبیی منداڵەکەم دەگۆڕم، ئاساییە باوکی لەو ناوەدا بێت؟

نەک تەنیا باوک، بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە بوونی کەسی سێیەم دروست نییە. با هێشتا بچووکیش بێت، چ سوودێک لەوەدا هەیە کەسێکی تر تەماشای حاڵەتێکی تایبەتی بکات، ئەمە سەرباری ئەوەی خزمەت بە چەمکی (سنوورە کەسییەکان)ی منداڵەکەش ناکات.

> دایبی نەگۆڕینی منداڵ بە بەرچاوی کەسانی ترەوە، یارمەتیی گەشەی کەسێتیی منداڵ دەدات.

ئاورا (aura) یاخود سنووری کەسی: بریتییە لە سنوورە فیزیکی و نافیزیکییەکانی هەریەکێکمان. مرۆڤ حەز دەکات لە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیدا ئازاد بێت، واتە دڵنیا بێت لەوەی کەس بێ مۆڵەت دەستی بۆ نابات و سەیری ناکات. چەسپاندنی ئەم تایبەتمەندییە، سوودێکی زۆری دەبێت بۆ گەشەی کەسێتیی منداڵ.

## ئاساییە باوك دایبیی منداڵەکەی بگۆڕێت؟

> لە گۆڕینی دایبیی منداڵدا، دەبێت ڕەچاوی بنەمای (تەنها یەک کەس) بکرێت.

بەڵێ، ئاساییە.

هیچ گرفتێک لەوەدا نییە باوک دایبیی کۆرپەکەی بگۆڕێت و یارمەتیی هاوسەرەکەی بدات.

گرنگ ئەوەیە (تەنها یەک کەس) ئەم کارە بکات، جا ئەو کەسە دایک بێت یان باوک، بەڵام ئەوە ڕاست نییە هەر جارە و یەکێک پاکی بکاتەوە و دایبیی بۆ بگۆڕێت.

## لە حاڵەتی ناچاریدا، کێی تر دەتوانێت دایبیی منداڵ بگۆڕێت؟

هەتاکو حاڵەتێکی ناچاری نەیەتە پێش، پێویستە یەک کەس دایبیی منداڵ بگۆڕێت. هەستانی زیاد لە کەسێک بەم کارە، دەبێتە هۆی ئەوەی نەهێڵێت منداڵ کۆمەڵێک تایبەتمەندیی دەروونی پەیدا بکات، بەڵام ئەگەر هەر چار نەما، ئەوا پێشنیاری پەیڕەوکردنی ئەم ڕیزبەندییەی خوارەوە دەکەین:

### ١. پێش هەموو کەسێک، دایک یان باوک

ئەگەر هاتوو دایک ئەرکی گۆڕین و پاککردنەوەی منداڵی گرتبووە ئەستۆ، بەڵام بە هەر هۆیەک بۆ ماوەیەک نەیدەتوانی ئەو کارە بکات، ئەوکات دووەم گونجاوترین کەس بۆ ئەو کارە باوکە، چونکە هەم لە ڕووانگەی جەستەیی و هەم لە ڕووانگەی عاتیفییشەوە نزیکترین کەسی منداڵەکەیە، بەو جۆرە هاوبەندیی عاتیفی نێوان باوک و منداڵ توندوتۆڵتر دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر باوک بەبەردەوامی نەیدەتوانی ئەو کارە بکات، ئەوکات دەچینە سەر ئەو کەسەی کە لە ڕیزبەندیی دووەمدایە.

> ئەگەر دایک نەیدەتوانی دایبیی منداڵ بگۆڕێت، دەبێت باوک ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

### ٢. بژاردەی دووەممان، خانمێکی پێگەیشتووە

لە حاڵێکدا ئەگەر باوک بەردەست نەبوو، دەتوانرێ ئەرکی گۆڕینی دایبی بسپێردرێت بە یەکێک لەم کەسانە: نەنک، پوور.

ئەگەر ئەوانیش توانای ئەوەیان نەبوو بە بەردەوامی ئەو کارە بکەن، ئەوکات پەنا دەبرێتە بەر کچێک کە قۆناغی هەرزەکاریی تەواو کردووە، یان یارمەتیدەری ماڵ.

بەڵام دروست نییە کچێک دایبیی خوشکەکەی/براکەی بگۆڕێت، کە هێشتا قۆناغی هەرزەکاریی تەواو نەکردووە. برا -با هەرزەکاریشی تەواو کردبێت- کۆتا کەسە داوای یارمەتیی لێ بکرێت. ئەگەر هەر زۆر خوازیاری بەخێوکردنی منداڵن، ئەوا دەتوانین لە کارە لاوەکییەکاندا بەکاریان بخەین.

**ئەو کچەی هێشتا لە قۆناغی هەرزەکاریدایە، دروست نییە دایبیی براکەی/خوشکەکەی بگۆڕێت.**

**٣. مەرجێکی تری ئەو کەسەی منداڵەکەی دەدەینە دەست و پاکی دەکاتەوە، ئەوەیە خۆیشی منداڵ نەبێت**

چونکە بایەخپێدان و بێزنەهاتنەوە و نەرمونیانی لە مامەڵەدا، پیشەی کەسانی پێگەیشتووە. لەبەر ئەوە -بەدەر لە حاڵەتی پێویستی- پشت بە خوشکی گەورە یان ئەو خوشکەی دەبەستین، کە لە قۆناغی خوێندنی ئامادەییدایە. کوڕان با لەو تەمەنەشدا بن، کارمان بەسەریانەوە نییە. بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە گەنجان لەو تەمەنەدا، زۆر کەیفیان بەو جۆرە کارانە نایەت.

**کوڕان دوایەمین بژاردەمانن لەو ڕووەوە، کە پشتیان پێ ببەستین بۆ گۆڕینی دایبیی خوشک و براکانیان.**

## ئایا بەکارهێنانی شاف و کرێم و پڵیتە و ئەو شتانە بۆ چارەسەر، ئاساییە؟

ئەگەرچی بەکارهێنانی چارەسەر لە ڕێگەی کۆمەوە (anal)، کاریگەریی نەرێنیی ڕاستەوخۆی نییە، بەڵام پێشنیاری ئەوە دەکەین کۆتا ڕێگەچارەی بەردەممان بێت.

هەموو جۆرە دەستبردنێک بۆ ئەندامەکانی ناوچەی زاووزێ، زیان لە گەشەی هەردوو هەستی (شەرم و حەیا)ی منداڵ دەدات، کە دوو هۆکاری زۆر گرنگن لە پاراستنی منداڵ لەوەی دەستدرێژیی بکرێتە سەر. وەک چۆن گەورەکان حەز ناکەن لەو شوێنانەوە چارەسەر وەربگرن، منداڵانیش بە هەمان شێوەن.



**ئەگەر هەر هیچ ڕێگەچارەیەکی تر نەبوو، ئەوجا پەنا دەبرێتە بەر چارەسەر لە ڕێگەی کۆمەوە.**



کاتێك دایکان و باوکان بە مەبەستی چارەسەر دەست دەبەن بۆ ئەو ئەندامانەی منداڵەکانیان و ئەوانیش نارەزایی دەرنابڕن، ئیتر شتەکەیان بەلاوە ئاسایی دەبێتەوە، کەچی خۆی لە بنەڕەتدا دەبێت زۆر هەستیارانە مامەڵە بکەن ئەگەرچی بۆ چارەسەریش بێت، چونکە ئەو ئەندامانە چەند شوێنێکی تایبەتن و دوا هێڵەکانی سنووری کەسین.

لە لایەکی ترەوە، بەکارهێنانی شرینقەی کۆم (enema) لە کاتی قەبزیدا، بەتایبەت بۆ منداڵانی خوار تەمەن (٧) ساڵ، لە ڕووی پێدەگۆژییەوە بە شێوازێکی دروست دانانرێت، هەرچەندە لە ڕووی پزیشکییەوە ئاساییە. ئەم شێوازە ئازاربەخش و نارەحەتکەرە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ نەوێرێت لە تەوالێت دابنیشێت و ترسی ئەوەی لا دروست دەبێت ئەگەر دابنیشێت، ئازاری دەبێت.

بەدەر لەمە، هەندێك لە دایکان و باوکان خەمی ئەوەیانە بەکارهێنانی شاف بۆ دابەزاندنی تا بەتایبەت بۆ کوڕان، دەبێتە مایەی لادانی سێکسی. لە ڕاستیدا ئەمە خەمێکە لە جێی خۆیدا نییە، چونکە هیچ پەیوەندییەک لە نێوان بەکارهێنانی شاف و لادانی سێکسیدا نییە.

دەبێت ئەو کرێمانەش کە وەک چارەسەر بۆ ئەو ئەندامانە بەکار دەهێنرێن، بێ زۆر هەڵگلۆفین و زەبر خستە سەریان بەکار بهێنرێن. هەروەها تا بکرێت منداڵەکە خۆی بیکات باشترە، وەک لەوەی یەکێکی تر بۆی بکات. پێویستە منداڵەکانمان فێر بکەین، خۆیان بەو کارانە هەستن.

> **بەکارهێنانی شاف و لادانی سێکسی، هیچ پەیوەندییەکیان بەسەر یەکەوە نییە.**

دەبێت ئەوە بزانین کە یەکێک لە هۆکارەکانی دەستپەڕکردنی منداڵ، (child masturbation) دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتە و هەڵە بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی بۆ ئەو شوێنانەی بەکار هێنراون. بەتایبەت ئەو دەرمانانەی کە پێکهاتە کیمیاییەکانیان حەساسیەت دروست دەکەن، دەبێت لە ژێر ڕێنمایی پزیشکی خاوەن ئەزموونندا بەکار بهێنرێن.

کاریگەریی ئەو چەشنە دەرمانانە، بەتایبەت لە کچاندا زۆرتر ڕەنگ دەداتەوە، دەبێتە هۆی خوران و هەستیاریی ئەو شوێنانە.

> **یەکێک لە هۆکارەکانی خۆڕەحەتکردنی منداڵان، کاریگەریی ئەو دەرمانانەیە کە بۆ ئەندامی زاووزێی بەکار هێنراون.**

## ئایا هەڵپەڕاندنی منداڵ لە سەر کۆش، یارییەکی دروستە؟

هەڵپەڕاندنی سەر کۆش، یاریکردن لە سەر دەسکی قەنەفە، مانەوەی زۆر لە سەر ئەسپی یاری، بەستنی کەمەری سەلامەتیی ناو سەیارە بە جۆرێک بکەوێتە سەر ئەو شوێنانە، کۆمەڵە هەڵسوکەوتێکن دەبنە مایەی

هەستیاریی ئەندامی زاووزێ. پەستان خستنە سەر ئەو شوێنانە یان لێخشاندنیان، لە هۆکارەکانی دەستپەڕی منداڵانن.

بۆ خەوتنیش وا گونجاوە لە سەر دەم نەیانخەوێنین، چونکە ئەگەری بەئاگاهاتنەوە و وروژانی ئەو شوێنانە زیاتر دەبێت. خۆ ئەگەر منداڵ حەزیشی لەو شێوازە خەوتنە بوو، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، هانی دەدەین لە سەر لا بخەوێت، بەتایبەتیش لە سەر لای ڕاست، چونکە دڵ لای چەپە. خەوتنیش لە سەر ئەو لایە، ڕەنگە پەستانی بخاتە سەر.



**پێویستە لە زۆر یاریکردن بەو یارییانە دوور بکەوینەوە، کە دەبنە هۆی وروژاندنی ئەندامی زاووزێ.**



**ئایا خووی دەستپەڕ بە هۆکاری بۆماوەیی، لە دایک و باوکەوە دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ؟**

نەخێر.

دەستپەڕی منداڵ -بەدەر لە هۆکارە فسیۆلۆژییەکان- دەرئەنجامی شێوازی هەڵەی پەروەردەییە، لە ڕێگەی بۆماوەییەوە ناگوازرێتەوە.

دەستپەڕی منداڵ لە چێژی سێکسییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، تاکو بڵێین لادانی ڕەوشتییە. لە ڕاستیدا ئەم ڕەفتارە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ خوراندنی هەر جێیەکی تری پێست، بەڵام بە بەردەوامبوون لە سەری، بەتایبەت ئەگەر هاوبەندیی نێوان دایک و منداڵ لاوازبێت، دوور نییە سەربکێشێت بۆ ئالوودەیی و لێی ببێت بە خوو.

هۆکارەکانی هەرچییەک بن لە کۆتاییدا دەستپەڕی منداڵ کردارێکە بۆ خۆخەڵافاندن. کاتێک منداڵ هەست بە تەنیایی دەکات و ئەو پێداویستییەی پڕ

نـاکرێتەوە کە هەیەتـی بـۆ پەیوەنـدی لەگەڵ کەسـانی تـر، یـان کە هەسـت بە دڵشکاوی دەکات و بێزار دەبێت، خۆی بە ڕووی دونیای دەرەوەیدا دادەخـات و بە خۆیەوە سـەرقاڵ دەبێـت. چارەسـەی ئەم حاڵەتەش -بە مەرجـی چارەسـەرکردنی ئەو هۆکـارانەی پێشـتر باسـمان کـردن- بەهێزکردنـی هاوبەنـدیی نێوان دایـک و منـداڵە. بـۆ ئەوەی دەسـتبەرداری ئەو ڕەفتـارەی ببێـت، پێویسـتە جـێگەی ئەو حەزەی بە حەزێکی بەهێزتر بۆ پڕ بکەیـنەوە. چ شـتێکیش لە پەیوەنـدیی نێوان دایـک و منداڵ چێژبەخشترە!



**ئەزموونی سێکسیی دایک و باوک، هیچ کاریگەرییەکی نییە لە سەر دەستپەڕی منداڵ. دەستپەڕکردنی منداڵ بۆماوەیی نییە .**



**ئـایـا خۆخشـاندن و خۆنووسـاندنی بەردەوامـی منـداڵ بە شوێنانەوە، بە واتای دەستپەڕ دێت؟**

نەخێر.

جاری وایە منداڵ لەتاو بێزاری، خەیاڵڕۆیشتن یان چێژوەرگرتن، کـرداری خۆخشاندن دەنوێنن. بەتایبەتی کوڕان لە نێوان تەمەنی (٣-٦) ساڵیدا، یـاری بە ئەنـدامی زاووزێیـان دەکەن. هـیچ کـام لەوانە دەسـتپەڕ نـین. دیـارترین نیشانەی بینراوی دەستپەڕ ئەوەیە، منـداڵەکە بە شـێوەیەکی خێـرا و بەتونـدی خۆی دەخشێنێت و ناتوانێت بەر بە خۆی بگرێت، کە ئەو کـارەش دەکـات، هەموو گیانی دەبێت بە ئارەقە. کاتێکیش دەتەوێت بیوەستێنێت، کـاردانەوەی شەڕانگێزانە و توند دەنوێنێت.

ئەم کردارە لە هەموو تەمەنەکانی پێش شەش ساڵیدا بەرچاو دەکەوێت، تەنانەت لە منداڵی (١) ساڵانەشدا دەبینرێت، پەیوەندییشی نییە بە ڕەگەزی منداڵەکەوە.

لە ڕاستیدا منداڵ بە مەبەستی چێژی سێکسی وا ناکات، بەڵام دەڵێی چی ڕەفتارەکەی بەو جۆرەیە، دەبێت ئەوەش بڵێین کە بەئەنقەست و ویستی خۆی ئەو کارە ناکات.

کاتێک منداڵ لە سەر ئەو حاڵەتە دەبینین، دروست نییە تەریقی بکەینەوە و سووکایەتیی پێ بکەین و مەسەلەکە زەق بکەینەوە. چارەسەرەکەشی لە سزادان و ترساندندا نییە، بەڵکو لە بەهێزکردنی پەیوەندییە عاتیفییەکانیدایە. بەڵام ئەگەر وا لێکی بدەیتەوە کە خەریکی بێڕەوشتییە و بەزۆر بتەوێت پێی تەرک بکەیت، ئەوکات بزانە کە یادەوەرییەکی تاڵ لە یادگەیدا جێ دەهێڵێت.


**تایبەتمەندیی دەستپەڕی منداڵ ئەوەیە، بە شێوەیەکی بەردەوام و توند و لەگەڵ ئارەقەکردنەوەیەکی زۆردا خۆی لە شتێک بخشێنێت.**


**ئایا بەکارهێنانی زۆرداری لەگەڵ منداڵدا بۆ ئەوەی شتێکی فێر بکەیت، هەڵەیە؟**

ئەزیەتدانی جەستەی منداڵ، پاڵنان و گوشینی بە هەر هۆیەک بێت، تەنانەت ئەوەش کە بە مەبەستی یاری خۆت بدەیت بەسەریدا، لە ڕووی پێدەگۆژییەوە هەڵەیە، چونکە ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە زیان دەدات لە گەشەی (سنوورە کەسییەکان)ی ئەو منداڵە!)

بەڵام جاری وا هەیە ناچار دەبێت (لەبەر تەندروستیی منداڵەکە)، زۆری لێ بکەیت، لەبری ئەوەی بە زۆر و زۆرداری دەرمانێکی دەرخوارد بدەیت، هەوڵ بدە قسەی لەگەڵدا بکەیت و لە دڵەڕاوکێیەکەی تێبگەیت.

> ئەگەر منداڵ نەیویست کارێک ئەنجام بدات، ئەوا بە زۆرلێکردن و ئازاردانی جەستەیی پێی ئەنجام مەدە. چونکە کاریگەریی نەرێنیی دەبێت لە سەر گەشەکردنی کەسێتییەکەی.

حەبخواردن، دەرزیلێدان، خوێنوەرگرتن، ددانکێشان، تیشک، خەتەنەکردن، لە نموونەی ئەو حاڵەتانەن کە هەموو منداڵێک تا ڕادەیەک لێیان دەترسێت. گەورەکان لەتاو سەرنج خستنە سەر بەرژەوەندیی منداڵەکەیان، ئاگایان لەوە نییە لە لایەکی ترەوە زیانی لێ دەدەن. چاکی مەکە با خراپ نەبێت، ئەوەیە!.

پێش ئەنجامدانی هەر چارەسەرێکی پزیشکی، پێویستە دایک و باوکی دڵەڕاوکێیەکەی بڕەوێننەوە و بۆی ڕوون بکەنەوە چەندە ئازار دەکێشێت و چیی لێ دەکەن، تەنانەت دەتوانن پێشتر خۆیان بەکرداری نیشانی بدەن.

بەو جۆرە، منداڵ هەست بە دڵنیایی و ڕێزداریی خۆی دەکات و ئەو بەرگری و پێداگرییەی هەیەتی بەرامبەر خۆبەدەستەوەدانی زۆرەملێ، نارووشێت.

> پێویستە دایکان و باوکان زانیاری بدەن بە منداڵەکەیان، سەبارەت بەو شێوازی چارەسەرەی بۆیان دەکرێت و بڕی ئەو ئازارەی پێیان دەگات.

تەنانەت لەو دۆخانەشدا کە منداڵ قەناعەت ناهێنێت، نابێت پەنا ببەینە بەر زۆرلێکردن. خۆ ئەگەر شتەکە هەر دەبوو بکرێت، ئەوکات کاری پەسەند ئەوەیە کەسێک قەناعەتی پێ بکات کە کاریگەریی

لە سەری هەیە. ئەگەر نا بەستنەوەی قۆڵ و قاچەکانی و فشار خستنە سەر سەر و ملی، شوێنکاری نەرێنی لەسەر کەسایەتیی منداڵ جێ دەهێڵێت.

> تەنانەت لەو کاتانەشدا کە منداڵ ملەجیڕە دەکات و قەناعەت ناهێنێت، نابێت زۆری لێ بکرێت.

لە هەموو حاڵ و بارێکدا، پێویستە ئەوەی بۆ باس بکرێت کە هەر دەبێت چارەسەرەکە ئەنجام بدرێت. خۆ ئەگەر ترس و دڵەڕاوکەکەی هەبوو، پێویستە بیرەوێنینەوە، نەک بمانەوێت لە یەک دوو خولەکدا بێتە سەر قسەی ئێمە، واتە هەنگاوبەهەنگاو بۆی بچین نەک بەکتوپڕی.

**ئایا هیچ گرفتێك لەوەدا هەیە، منداڵ لە بەرچاوی کەسانی تر جل بگۆڕێت؟**

هەر لەبەر ئەوەی منداڵە و نازانێت شەرم و حەیا چییە، دروست نییە لە بەرچاوی کەسانی تردا ناچاری جلگۆڕین بکرێت. چۆن گەورەکان لە بەرچاوی کەسانی تر جلەکانیان ناگۆڕن و نیگەران دەبن بەوەی تەماشا بکرێن، هەر بەو شێوەیە دەبێت هەنگاوبەهەنگاو منداڵ فێر بکرێت لە هەموو شوێنێکدا جلەکانی نەگۆڕێت.

لەو حاڵەتە سروشتییانەشدا کە منداڵ ئارەقە دەکاتەوە، یان جلەکانی پیس دەکات و خۆی تەڕ دەکات، مەرج نییە لەبەرچاوی ئەوانی تر بیگۆڕین، دروست وایە بیبەینە شوێنێکی تایبەتی و لەوێ یارمەتیی گۆڕینی جلەکانی بدەین. ئەگینا کە لە لای کەسانی تر بە پەلەپروسکێ دەیگۆڕیت، هەستی مەحرەمیەت و سنوورە کەسییەکانی زامدار دەکەیت.

پێویستە هێواش هێواش فێری ئەوەی بکەین، کە لە دوای تەمەنی (٣) ساڵییەوە، لای کەسانی تر خۆی نەگۆڕێت. خۆ ئەگەر پێویستیشی بە یارمەتی بوو، پێویستە بنەمای (تەنها یەک کەس) پیادە بکەین.

"ئەو شتانەی گەورەکان لە کاتی جلگۆڕیندا پێی بێزار دەبن، منداڵانیش پێی بێزار دەبن."

بەتایبەت لە کاتی گۆڕینی جلی ژێرەوەدا، ئەو کەسەی دەیگۆڕێت، پێویست دەکات سەیری جەستەی منداڵەکە نەکات و شتێک نەکات منداڵەکە شەرم بکات. ئەوەندە بەسە زەردەخەنەی لە سەر لێو بێت، تا منداڵەکە هەست بە ڕێزداریی جەستەی بکات.

دایک و باوکی هۆشمەند لە هەموو هەنگاوێکی گۆڕینی منداڵەکەیاندا، مۆڵەتی لێ وەردەگرن و ئاگاداری دەکەنەوە. بۆ نموونە؛ دەڵێن: "ئێستاش بە یارمەتیی خۆت، پانتۆڵەکەت دادەکەنم." منداڵ مافی سروشتیی خۆیەتی، زانیاریی هەبێت دەربارەی هەر مامەڵەیەک کە پەیوەندیی پێوەی هەیە.

هەموو کردارێک لەسەر جەستەی منداڵ تایبەتە، جا لەبەرکردن و گۆڕینی پۆشاک بێت یان بەکارهێنانی دەرمان و چارەسەر. دروستکردنی ئەو هەستەی کە هیچ کەس مافی دەستتێوەدانی ئەو جەستەیەی نییە، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەوەی ئەو منداڵە کەسێتییەکی ڕێزداری هەبێت.

"کاتێك منداڵ جلەکانی دەگۆڕێت، نابێت تەریق بکرێتەوە."

لە لایەکی دیکەوە، جلگۆڕین و جللەبەرکردن یەکێکە لە وردەکارییەکانی ژیانی مرۆڤ. هەڵبژاردنی ڕەنگی گونجاو و لێهاتن و جوانپۆشی، لە ڕەگەزەکانی کەسایەتیی خاوەن ڕێزن. جاری وایە منداڵ لەتاو پەلەپەلی دایک و باوکی، نازانێت چیی لەبەر کردووە. ئەو منداڵەی لە ڕووی پۆشاک و جلوبەرگەوە بایەخی

پێ نەدراوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە بایەخی پێ نادرێت.

جلوبەرگی منداڵ پێویستە بەگوێرەی تەمەنەکەی بێت. زیاتر پێشنیاری هەڵبژاردنی ئەو پۆشاکانە دەکەین کە وێنەی کارەکتەری فیلمکارتۆن و ئەو شتانەی پێوە نییە، بۆ ئەوەی منداڵ لاساییان نەکاتەوە. هەروەها بە دروستی نازانین منداڵ هاوشێوەی گەورەکان بپۆشێت، وەک ئەوەی کۆپییەکی بچووککراوەی ئەوان بێت. زۆر جاریش گەورەکان گەزگەز باڵا دەکەن کە منداڵەکانیان بە پانتۆڵ و بۆینباخ یان عەزیی بووکێنییەوە دەبینن، لە کاتێکدا لە ڕووی پێدەگۆڕییەوە بە پەسەند دانانرێت، چونکە وا هەست دەکات ناچارە شکۆی جلەکانی ڕابگرێت.

ئەو منداڵە تەمەن (٧) ساڵانەیەی قات و بۆینباخی لەبەردایە، ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی هەڵبەزودابەز بکات و لێرەوە بۆ ئەوێ ڕابکات. ئەوانەشی دەیبینن، مامەڵەی کەسێکی پێگەیشتووی لەگەڵدا دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی چەواشەکردنی ئەو منداڵە، چونکە چاوەڕێی ئەوە دەکات کاتەکانی تریش ئاوا بایەخی پێ بدەن و بێن بە دەوروخولیدا.

بەڵام جیاوازە ئەگەر منداڵ لە بۆنە تایبەتییەکاندا، لە نموونەی (ئاهەنگ و جەژن و ساڵیادی لەدایکبوون)دا، جلی تایبەت بەو یادانە لەبەر بکات. بەڵام جاری وایە لە ئاهەنگی هاوسەرگیریدا، دەبینی جلی بووک و زاوایان کردووەتە بەری دوو منداڵی خنجیلانە و قۆڵیان پێ کردوون بە قۆڵی یەکدا، لە ڕاستیدا تا بڵێی ڕەفتارێکی هەڵەیە.

**ئەگەر پێویستی کرد دایک یان باوک یارمەتیی منداڵەکەیان بدەن لە گۆڕینی جلەکانیدا، دەبێت ڕەچاوی بنەمای (تەنها یەک کەس) بکەن.**

## ئاساییە دایك و باوك لەبەرچاوی منداڵەکەیان جلەکانیان بگۆڕن؟

نەخێر، ئاسایی نییە.

وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لە دوای تەمەنێکی دیاریکراوەوە ڕەچاوکردنی بنەمای (تەنیایی لە جلگۆڕیندا)، بەشێکی گرنگە لە گەشەی کەسێتیی منداڵ. دیوی دووەمی ئەم بنەمایە ئەوەیە، کەس نەبینێت و سەیری هیچ کەس نەکات لە کاتی جلگۆڕیندا.

دایک و باوک دەبێت ئاگاداری ئەم خاڵە بن، تەنانەت ئەگەر لە ژووری خۆیشیاندا بن. کاتێک منداڵ دەبینێت دایک و باوکی لە هەمان ژووردا جلەکانیان دەگۆڕن، ئەوە دێت بە مێشکیدا کە: "بۆچی دایە و بابە پێکەوە جلەکانیان دەگۆڕن؟".

**چەندە پەیڕەوی بنەمای (تەنیایی لە خۆگۆڕیندا) بکرێت، هێڵی سنوورە کەسییەکانی منداڵ ئەوەندە تۆختر دەبێتەوە.**

لەپێناو پەرەدان بە چەمکی سنوورە کەسییەکان لای منداڵ، پێشنیاری ئەوە دەکەین لەو کاتانەدا کە منداڵی لێیە، دایکان و باوکانیش بنەمای (تەنیایی لە جلگۆڕیندا) لە نێوان خۆیاندا جێبەجێ بکەن، نەک ئەوەی منداڵەکەیان بنێرنە دەرەوە و پێکەوە خۆیان بگۆڕن؛ چونکە ئەوکات چەندین پرسیاری سەیروسەمەرە مێشکی منداڵەکەیان دەتەنێت و سازگاریی بیرکردنەوەکانی لێڵ دەکات.

بۆ نموونە؛ لەو حاڵەتانەدا دایکان و باوکان دەتوانن بەم جۆرە مامەڵە بکەن: "گیانەکەی دایە، با ئێمە بچینە دەرەوە، بابە جلەکانی دەگۆڕێت." بەڵام نەک منداڵەکە بکەنە دەرەوە و خۆیان لە ژوورەوە بمێننەوە.

کاتێـک پرسـیاری ئەوەی کـرد؛ بۆچی نابێت دایک و بـاوکی ببینێت کە جلەکانیان دەگۆڕن، دەتـوانین بەم شـێوەیە وەڵامـی بـدەینەوە: "حەز ناکات/شـەرم دەکـات کەسـێکی تـر جەسـتەی ببینێـت." هاوکـات ئەم وەڵامە هەستیاریی منداڵ تونـدوتۆڵتر دەکـاتەوە، سـەبارەت بەوەی کە جەسـتەی ئەویـش لەلایەن کەسـی دیکەوە نەبینرێت.

> **کە منداڵ پرسیی بۆچی نابێت دایک و باوکی لە کاتی جلگۆڕیندا ببینێت، دەتوانین بەم جۆرە وەڵامی بدەینەوە: "چونکە پێی خۆش نییە کەسێکی تر جەستەی ببینێت."**

بەشێک لە دایکان و باوکان پێیـان ئاسایییە دایـک و کـچ یـان بـاوک و کـوڕ پێکەوە بن، کاتێـک جلەکانیـان دەگـۆڕن، لە ڕاستیدا جیاکـارییەکی لەو جـۆرە هەڵەیە، ئێمە دەبێـت هەوڵـی ئەوە بـدەین بنەمـای (تەنیـایی لە جلگۆڕینـدا) بـۆ جیاوازی لە ڕەگەز و تەمەندا جێبەجێ بکەین. ئاخر حیکمەتـی ئەم بنەمـایە لەبەر جیـاوازی ڕەگەزی ئەنـدامانی خێـزان نییە، بەڵکـو لەبەر پاراسـتنی (سـنوورە کەسییەکان)ی تاکە. ئەمە بەدەر لەوەی ئەو ڕەفتارە دەبێـتە هۆکـاری پۆلێنکـاری لە سـەر بنەمـای ڕەگەز، کە هەر لە بنچینـەوە هەڵەیە.

> **چ منداڵ جلەکانی بگۆڕێت چ دایک و باوک، وا باشە لە هەردوو بارەکەدا دەرگای ژووری جلگۆڕین بەداخراوی بمێنێتەوە تا لێدەبیتەوە.**

منـداڵانی تەمەن (٠-٤) لە تەنیـایی دەترسـن، حەز دەکەن دایـک و باوکیـان بەردەوام لە لایان بن، بـۆیە ڕەنـگە بەتەنیا مانەوەیـان تـا ئەو کـاتەی دایـک و بـاوک جلەکانیان دەگۆڕن، شتێکی باش نەبێـت.

چار چییە؟ لەو حاڵەتانەدا دەتوانین پێیان بڵێین: "ئازیزەکەم، دەتوانی چاوت دابخەی تا جلەکانم دەگۆڕم"، یان "بێزەحمەت دەتوانیت ڕوو بکەیتە ئەودیو، تا تەواو دەبم."

**هیچ کێشەیەك لەوەدا هەیە، منداڵ شێوازی جلوبەرگی ئەو خێزانانە ببینێت کە کلتووریان جیاوازە؟**

**نەخێر، هیچ کێشە نییە.**

بەپێچەوانەوە، پێکەوەبوون و کاتبەسەربردن لەگەڵ کەسانی تر کە کلتوور و تەرزی ژیانی جیاوازیان هەیە، مایەی دەوڵەمەندییە بۆ منداڵ.

ئەو تێکەڵاوی و بەریەککەوتنە کلتوورییەی کە لە کۆمەڵگە فرە کلتوورەکاندا دێتە کایەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ بکەوێتە بەراوردکاری لە نێوان تەرزی ژیان و دونیابینیی ئەوانی تر و خێزانەکەی خۆیدا، ئەوەش بۆخۆی پێشهاتێکی تەندروستە. بۆ نموونە؛ کە دەبینێت جلەکانی پووری یان خانمی دراوسێکەیان لەوانەی دایکی جیاوازە، چاوی بە ڕووی جیاوازی و هەمەڕەنگییەکاندا دەکرێتەوە. تاکو کلتوور و فەرهەنگی جیاوازیش ببینێت، ئەوەندەی تر کەسێتییەکەی خۆی دەگرێت و ئاسۆی تێڕوانینی فراوانتر دەبێت.

> **ئاشنایی منداڵ بە کلتوورە جیاوازەکان، یارمەتیی گەشەی دەدات نەک لەڕێی لا بدات.**

ستەم دەکەیت لە منداڵەکەت، ئەگەر چاوەڕێی ئەوەی لێ بکەیت تەنها و تەنها لەگەڵ ژینگە و هاوڕەنگەکانی خۆیدا پەیوەندی دروست بکات. خەمت نەبێت، ئاشنابوونی بە کلتوور و ژیانی کەسانی تر، لە خێزانەکەی خۆی داینابڕێت.

گرنگ ئەوەیە پەیوەندیی نێوان منداڵ و خێزانەکەی تەندروست بێت. ئەگەر لە ناو خێزانەکەیدا دڵخۆش بوو و هاوبەندییەکی پتەوی بە دایک و باوکیەوە هەبوو، بینینی شێوازی ژیانی کەسانی تر بەرەوپێشی دەبات.

بەڵام ئەگەر هەستی ناخۆشی بەرامبەر دایک و باوکی هەبوو و کەشی خێزانیان لە گفتوگۆ دوور بوو، بەدڵنیاییەوە ئەوکات بە کەسانی تر کاریگەر دەبێت.



**منداڵ لە ژێر کاریگەریی خێزان و دەوروبەریشیدایە.**



هیچ منداڵێک ناتوانێت گوێڕایەڵیی ڕەهای بۆ خێزانەکەی هەبێت و تەنیا لە ژێر کاریگەریی خێزانەکەیدا بمێنێتەوە. هەر هەوڵێکی لەو جۆرە، منداڵ و دایک و باوکیش ماندوو دەکات.

هەندێک جار منداڵ لە قوتابخانەدا حەزی دەچێتە سەر پۆشینی کۆمەڵە جلوبەرگ و جوانکارییەک، کە ڕەنگە بە لای دایک و باوکەوە نامۆ بن. لێرەدا مامەڵەی تەندروست ئەوەیە، دایک و باوک ڕێگرییان لێ نەکەن ئەگەر زانییان شتەکە گونجاوە. خۆ ئەگەر گونجاو نەبوو، دەتوانن بکەونە گفتوگۆ لەگەڵیاندا و ڕوونکردنەوەی لۆژیکییان پێشکەش بکەن.

منداڵ لە ڕێگەی چاولێکردنەوە فێری هەڵسوکەوتکردن دەبێت، بۆیە شتێکی ئاساییە جارجار پەرۆشیی بۆ دروست ببێت و خوو بداتە ڕەفتار و پۆشاکی دەگمەن و جیاواز، واتە شایانی ئەوە نییە زۆر لەسەری بوەستین. هەندێ کاتیش پێویست دەکات بە جلوبەرگی خۆماڵییەوە بەشداریی بۆنە نەتەوەییەکان بکات، تاکو هەستەکانیشی تێکەڵی هەڵسوکەوتەکانی ببن.



**ڕێزگرتنی دایک و باوک لە خواستەکانی منداڵ، واتای ئەوە نییە هەموو شتێکیان بەقسە بکەیت.**



## تا چ سنوورێك ڕێگە دەدرێت منداڵ بەڕووتی لە ناو ماڵدا بگەڕێت؟

لە کاتی گۆڕینی دایبیدا ،منداڵان حەزیان لەوەیە هەڵبستنەوە و بەڕووتی بەملا و ئەولادا ڕابکەن. هەندێك جاریش پێش ئەوەی جل لەبەر بکەن، لە گەرماو دێنە دەرەوە و دەیکەن بە یاری. ئەمە تا بڵێی شتێکی ئاساییە، هیچ پەیوەندییەکی بەسەر خراپیی گەشەی سێکسییەوە نییە. ئەو هەوا خۆشەی بەر پێستی دەکەوێت، ئەو ئازادییەی لە ئەنجامی ڕزگاربوونی لە دایبی هەستی پێ دەکات، زۆر بۆی باشە. پێویست ناکات خۆمان سەغڵەت بکەین و بیکەین بە هەرا، وازی لێ بێنە با بۆ خۆی لەو هەستە خۆشەدا بژی.

**دوای تەمەنی (٣) ساڵی، پەسەند نییە منداڵ بەڕووتی بە ناو ماڵدا بگەڕێت.**

جاری واشە بە هۆی تەسکی یان زبریی جلەکانیەوە، خواخوایەتی قوتاری بێت لێیان.

جلی نایلۆن و ئارەقەکێش دەبێتە هۆی نارەحەتی. جلی نەرمونۆڵ و لۆکە زیاتر پەسەندە. تەسکی و زبرییش، منداڵ نارەحەت دەکات.

گرنگ ئەوەیە لە بەرچاوی کەسانی تر بە ڕووتی نەگەڕێت. بنەمای تەنیایی، بۆ دایبی گۆڕین و خۆپۆشتەکردنی دوای گەرماویشە.

لە دوای تەمەنی (٣)ساڵییەوە، دەبێت ئەوە بۆ منداڵ ڕوون بکرێتەوە کە تەنانەت لای دایکیشی نابێت بەڕووتی هاتوچۆ بکات.

## چی بکرێت باشە ئەگەر دایك و باوکی بەڕووتی بینی؟

پاش تەمەنی (٣) ساڵی، منداڵ لە هەر تەمەنێکدا بێت، تووشی سەرسامی دەبێت ئەگەر کەسێک بەڕووتی ببینێت. شتێکی ئاساییە، یان خێرا ئەو شوێنە جێ دەهێڵێت، یان لە جێگەی خۆیدا وشک دەبێت.

لە بەرامبەر ئەو حاڵەتە چاوەڕواننەکراوانەدا، لەوانەیە هەست بە شەرم یان خەتاباری بکات.

> دەتوانین ڕووداوە کتوپڕەکان بکەین بە دەرفەتی فێرکردن.

یەکەم کاری کەسی پێگەیشتوو ئەوەیە، نەهێڵێت منداڵەکە هەست بە خەتاباری بکات، نەك بچێت لەخۆوە کاردانەوە بنوێنێت.

منداڵەکە خۆی لە شەرمدا سوور و شین هەڵگەڕاوە، ئیتر چ پێویست دەکات تۆ بێیت کاردانەوەیەکی ڕەق بنوێنیت و شوێنەوارێکی ناخۆش لە یادگەیدا جێ بهێڵێت!.

ژینی پڕ جۆش و وزەی منداڵ، وا دەکات بەزەحمەت فێری ئەوە ببێت لە دەرگا بدات ئەوجا بێتە ژوورەوە. بەتایبەت منداڵانی خوار تەمەن (٧) ساڵ، زووزوو ئەوەیان لێ بەسەردا دێت. پێویستە دایکان و باوکان ئەو ساتانە گەورە نەکەن و نەیکەن بە یادەوەرییەکی ناخۆش لە یادگەی ڕۆڵەکەیاندا.

خودی ڕووداوەکەی بیر دەچێتەوە، بەڵام ئەو کاردانەوەیەی لەبیر ناچێتەوە کە لەو کاتەدا ڕووبەڕووی بووەتەوە.

> دەتوانین منداڵەکانمان فێر بکەین، لەو جۆرە حاڵەتانەدا داوای لێبوردن بکەن.

منداڵ لەتاو شەرم و سەرسامیی خۆی، چاوی دادەخات یان خێرادەڕواتە دەرەوە. پێویستە کەسی بەرامبەریش وەک کاردانەوەیەکی

سروشتی، بەپەلە شتێک بدات بە خۆیدا یان خۆی بداتە پەنا شوێنێک. ئەم چەشنە ڕووداوانە لە زەردەخەنەیەک زیاتر هەڵناگرن، بۆیە وا باشە زۆر لەسەریان نەڕۆین. ئەوجا کە هەستمان کرد منداڵەکە لە ژێر کاریگەریی ڕووداوەکە هاتووەتە دەرەوە، دەتوانین بە شێوەی کرداری فێری بکەین چۆن بچێتە ژووری یەکێکی ترەوە.

هەروەها دەبێت بە شێوەی کرداری فێری ئەوەی بکەین چۆن خۆی داپۆشێت، ئەگەر لەلایەن یەکێکەوە لە دۆخێکی نائاساییدا بینرا. هەر لە چۆنێتیی خۆداپۆشین بە شتێک، تاکو دەگاتە شێوازی ڕاوەستانی.

> پێویستە بەکردەیی بۆی ڕوون بکەینەوە، کە چۆن جەستەیی خۆی بپارێزێت لەوەی یەکێکی تر چاوی پێی بکەوێت.

«بە بەردێک دوو نیشانە دەشکێنین: یەکەمیان، ناهێڵین هەست بە خەتاباری بکات. دووەمیان، دەرفەتی فێربوونی ئاکارێکی نوێ دەڕەخسێنین.»

## ئاساییە منداڵی کوڕ لەگەڵ دایکیدا بخەوێت؟

ئەی بۆ نا!

منداڵ کچ بێت یان کوڕ، پێویستە بە درێژایی (٢٤) مانگ لەگەڵ دایکیدا بخەوێت، بەتایبەت لە قۆناغی شیرخواردندا ئەم پێکەوەییە سوودی بۆ هەردوو لایان هەیە. ئەو منداڵانەی دوو ساڵی یەکەمی تەمەنیان لای دایکیانەوە دەخەون هەستی دڵنیایی و متمانەیان لە ئاستێکی بەرزدایە، واتە هاوبەندیی متمانەدارییان هەیە لەگەڵ دایکیاندا، هەر بۆیە دوای ئەو تەمەنە بەئاسانی لە دایکیان جیا دەبنەوە.

پێچەوانەی ئەمە، ورکن دەردەچن و بەردەوام بە دایکیانەوە نووساون.

پاش ئەو (٢٤) مانگە، دەبێت هەنگاوبەهەنگاو جیابوونەوە ڕوو بدات. بە پێنانە (٣٠) مانگی، دەبێت ئەو قۆناغە کۆتایی هاتبێت.

ئەو منداڵانەی هێشتا لە سەر شیر بەردەوامن، پێویستە لەوەبەدوا لە شیر ببڕێنرێنەوە. بێگومان ئەو هەنگاوە دڵەڕاوکە و بێزاریی منداڵ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەڵام کەشی دڵنیاییبەخش و دڵدەرەوەی دایک ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە. کاتێکیش هاوسەنگیی بەدەست هێنایەوە، دووبارە دەست دەکەینەوە بە پرۆسەی جیابوونەوە لە دایک.

> **ئەگەر لادانی کەسێتی لەئارادا نەبێت، ئەوا هیچ گرفتێک لە پێکەوە خەوتنی دایک و کوڕ یان باوک و کچدا نییە. بەستنەوەی ئەوەش بە سێکسەوە، پێچەوانەی سروشتی ئادەمییە.**

خەوتنی دایک و منداڵیش پێکەوە لە دوای (٣٠) مانگی، ڕەنگە بە خووگیری کۆتایی بێت و پرۆسەی جیابوونەوەی منداڵ قورستر بکات.

هەندێک پێیان وایە لە دوای (٦) مانگییەوە، دەبێت منداڵ لە شیر ببڕدرێتەوە و جێگەی جیا بکرێتەوە. بە بڕوای ئێمە، ئەوە بۆچوونێکی دروست نییە. ئاخر هێشتا منداڵ ئەوەندە هەستی متمانەی پەیدا نەکردووە، تاکو بە زۆر و گریان لە دایکی جیا بکرێتەوە. زانستی پێدەگۆژی پێمان دەڵێت، منداڵ بەرامبەر هیچ هەنگاوێکی سروشتی ناگری و کاردانەوەی نەرێنی نانوێنێت، ئەمە جگە لەوەی هەم دایکیش و هەم منداڵیش پێویستیان بە دروستکردنی ئەو هاوبەندییە عاتیفییەیە لە نێوانیاندا.

هیچ دایک و باوکێک (بەدەر لەوانەی لادانی کەسێتی و نەخۆشیی عەقڵییان هەیە)، هەستی سێکسی بەرامبەر ڕۆڵەکەی نییە. هیچ منداڵێک

بەوە تووشی لادانی سێکسی نابێت، (٢٤) مانگ شیری دایکی بخوات و لا یەوە بخەوێت.

لەو تەمەنەدا کە هێشتا منداڵ هۆشی نەکراوەتەوە، هەر شتێک ببێتە ڕێگر لە نزیکبوونەوەی دایک و منداڵ، بە زیان دەشکێتەوە بە سەر هاوبەندیی عاتیفی نێوانیاندا.

**بەریەککەوتنی جەستەیی، مەرجی سەرەکیی دروستبوونی هاوبەندیی نێوان دایک و کۆرپەیە.**

هەرچۆنێک بێت پاش تەمەنی (٤) ساڵی، منداڵ پێویستی بەوەیە لە ژووری تایبەتی خۆیدا بخەوێت. بەوەش هەستی سەربەخۆیی خۆی وەک تاک بەرەوپێش دەبات. تاکو تەمەنی (٧) ساڵییش ئاساییە منداڵ جاروبار حەز بکات بێتە لای دایک و باوکی، بەو مەرجەی بۆ ماوەیەکی کاتی بمێنێتەوە و بۆ خەویش بچێتەوە ژوورەکەی خۆی.

بەگوێرەی ڕێسا پەروەردەییەکان، منداڵ دەبێت لەو شوێنە خەبەری بێتەوە کە لێی خەوتووە. ڕێنمایمان بۆ دایکان و باوکان ئەوەیە، ڕەچاوی ئەم لایەنە بکەن.

**لە تەمەنی (٧) ساڵی بەدواوە تاکو باڵغبوون، بە هەموو شێوەیەک دەبێت منداڵ لە جێگەی خۆیدا بخەوێت و لە جێگەی خۆیشیدا چاو هەڵبێنێت.**

لە تەمەنی (٧) ساڵییش بەدواوە تاکو قۆناغە بەراییەکانی تەمەنی باڵغبوون، ئیدی منداڵ دەبێت بەتەواوەتی لە جێگەی خۆیدا بخەوێت و لە جێگەی خۆیشیدا چاو هەڵبێنێت. لەم تەمەنەشدا ئاساییە جاروبار هەست بە ترس و دڵەڕاوکە و بۆشایی عاتیفی بکات و پێویستی بە دایک و باوکی بێت، بەڵام لەگەڵ باڵغبووندا ئیتر پێویست دەکات بەتەواوەتی لە جێگەی خۆیدا بێت. ئەگەر

هاتوو بەدەگمەنیش پێویستی بە دایک و باوکی بوو، پێشنیاری ئەوە دەکەین ئەوان بچن بۆ لای نەک ئەو بێت بۆ لایان.

## ئایا دروستە دایک و باوك و منداڵ پێکەوە بخەون؟

ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە نێوان (٠-٢)ساڵدایە، دەتوانن بەبەردەوامی لای دایک و باوکیان بخەون، بەڵام لە (٣٠) مانگی بەدواوە دروست نییە.

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، دوور نییە منداڵ لە گەورەییشدا جاروبار ترس و دڵەڕاوکەی بۆ بێت و هەست بە لاوازی خۆی بکات و پێویست بکات بچێت بۆ لای دایک و باوکی تا خەمڕەوێنی بکەن. ئەمە حاڵەتێکی زۆر ئاساییە، بە مەرجێک دواتر بچێتەوە سەر جێگەی خۆی.

> شەو لە کوێدا خەوتبوو، بەیانییش کە چاوی کردەوە، پێویستە هەر لەو شوێنەدا بێت.

دووبارەبوونەوەی ئەم حاڵەتە تا یەک دوو جاریش لە مانگێکدا ئاساییە، بەڵام ئەگەر هەفتانە دووبارە بوویەوە، مانای وایە گرفتی منداڵەکە لەوە قووڵترە کە بیرمان لێ کردووەتەوە، دەبێت بەدوای ڕەگوڕیشەی هەستەکانیدا بگەڕێین، ڕەنگە پێویست بە هاوکاریی کەسی پسپۆڕیش بکات.

> هۆکاری هاتنی منداڵ بۆ ژووری دایک و باوکی هەرچییەک بێت، نابێت خێرا ڕەت بکرێتەوە.

بەهەرحاڵ، هۆکاری هاتنەکەی هەرچییەک بێت، پێویستە خێرا دەست نەنێین بە ڕوویەوە و هەستەکانی بە بچووک سەیر نەکەین. دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین:

کاتێك منداڵ بە بارێکی دەروونیی شڵەژاوەوە هانامان بۆ دەهێنێت، سەرەتا پێویستە لەپاڵ خۆماندا پاڵی بخەین و لەباوەشی بگرین، ئەوجا پێی بڵێین: "ئەگەر حەز دەکەیت، با بچین بۆ سەر جێگەکەی خۆت؟" لەوێ لای دەمێنینەوە تا خەوی لێ دەکەوێت. پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ژووری خۆمان.

**پاش ئەوەی باوەشی کرد بە دایکیدا و تۆزێک لای مایەوە، دایک و منداڵ پێکەوە دەچن بۆ سەر جێگەی منداڵەکە.**

منداڵەکە لە سەر جێگەکەی دایک و باوکی خەوی لێدەکەوێت، ئینجا هەڵیدەگرن و دەیبەنەوە بۆ سەر جێگەکەی خۆی، ئەمە لە ڕووی پێدەگۆڕیەوە دروست نییە.

## ئایا هیچ گرفتێک لەوەدا هەیە خاڵۆزا و پوورزا و ئامۆزا پێکەوە بخەون؟

بنەما سەرەکییەکەتان بیر دەخەمەوە: دروست نییە دوو کەس پێکەوە لە یەک جێگەدا بخەون، جا خوشک و برا بن یان هەر پەیوەندییەکی دیکەی خزمایەتی.

**لە تەمەنی (٤) ساڵی بەدواوە، نابێت منداڵان لە سەر یەک جێگە بخەون.**

خۆ ئەگەر لەبەر بەرتەسکیی ژوور و نەبوونی پێخەفی پێویست هیچ چارێکی دیکە نەبوو، ئەوکات ئەو منداڵانەی تەمەنیان (٤) ساڵان و بۆ خوارەوەیە، دەتوانن پێکەوە لە سەر یەک جێگە بخەون.

پێشنیاری ئەوە دەکەین منداڵ تا تەمەنی دەگاتە (٧) ساڵان، لەگەڵ خوشکەکەی یان براکەی لە یەک ژوور و لە جێگەی جیاوازدا بمێننەوە، چونکە ئەوە پەیوەندیی نێوانیان بەهێزتر دەکات.

خۆ ئەگەر دایک و باوک توانایان هەبێت لە تەمەنی (٧) ساڵی بەدواوە ژووری تایبەت بۆ منداڵەکانیان تەرخان بکەن، کارێکی زۆر باش دەکەن. لە تەمەنی (٧) ساڵییش بەدواوە، ئەوپەڕی تا (١٠) ساڵی گونجاوە لە یەک ژووردا بمێننەوە، لەوەبەدوا گەشەی کەسێتیی منداڵ داخوازی ئەوەیە هەریەکەیان ژووری تایبەتی خۆی هەبێت.

> **لە چاوی دایەگەورە و بابەگەورەدا نەوەکان هەموویان خوشک و بران، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەوان خوشک و برا نین، ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزای یەکن.**

پێکەوە خەوتنی خزمان لە سەروو تەمەنی (٤) ساڵییەوە دروست نییە، چ لە یەکماڵدا بێت یان لە میوانی.

لە میوانیدا تا تەمەنی (٧) ساڵی ئاساییە منداڵی خزم و خوێ لە هەمان ژوور، بەڵام لە جێگەی جیاجیادا بخەون. بۆ ئەو ئامۆزا و پوورزا و خاڵۆزایانەش کە لە هەمان ماڵدا دەژین، لە دوای تەمەنی (٤) ساڵییەوە باش نییە لە هەمان ژووردا بمێننەوە، هەرچۆنێک بووە دەبێت لە ژووری جیاوازدا بمێننەوە.

گەورەکانی خێزان وەها بیر دەکەنەوە کە نەوەکانیان وەک خوشک و براوەهان، بۆیە ئاساییە بە لایانەوە لێک نزیک ببنەوە و لە هەمان ژووردا بمێننەوە، بەڵام ئەمە بۆچوونێکی تەندروست نییە. لێکنزیکبوونەوەی خاڵۆزا و ئامۆزا و پوورزا، هەرگیز وەک نزیکبوونەوەی خوشک و برا نییە لە یەکتری.

خێزانەکان لە ناو خۆیاندا دەڵێن: "ئاسایییە هەردووکیان کچن"، یان "چی دەبێت کوڕن، با بۆخۆیان پێکەوە بمێننەوە"، ئەو جۆرە خێزانانە دەبێت بزانن کە ئەوە هەڵسوکەوتێکی دروست نییە.

> پەیوەندیی نێوان ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزا وەک پەیوەندیی نێوان خوشک و برا نییە.

## ئایا منداڵ دەتوانێت لای خزمەکانی بخەوێت؟

زۆر ئاسایییە منداڵ لای باپیرە و داپیرەی خۆی بخەوێت.

> مەبەست لە مانەوەی منداڵ لای گەورەکانی خێزان، (خەواندن)ە نەک پێکەوە خەوتن.

مانەوەی منداڵ لای گەورەکانی خێزان سوودی پێ دەگەیەنێت، بەو مەرجەی زووزوو نەبێت. واتە نابێت بەبەردەوامی بێت، چونکە ئەوکات لەبری دایک و باوکی، هاوبەندیی لەگەڵ ئەواندا دروست دەکات، کە ئەوەش لە ڕووی پێدەگۆڕییەوە بەڕاست دانانرێت. ناڵێین با هاوبەندیی لەگەڵ باپیرە و داپیرەی نەبێت، مەبەستمان ئەوەیە بەهێزترین هاوبەندیی منداڵ دەبێت لەگەڵ دایک و باوکیدا بێت.

خەوتنی منداڵ لەگەڵ مام و خاڵ و پوور، لە ڕووی گەشەکردنی ناسنامەی سێکسییەوە هیچ گرفتێک دروست ناکات، بەڵام پێویستیش نییە. لە حاڵەتی ئاساییدا دەبێت پێویستی بەوە نەبێت لای ئەوان بخەوێت، بەڵام ئەگەر پێداویستییەکی لەو جۆرە هاتبووە ئاراوە، ئەودەم پێویستە سەرنجی هاوبەندیی نێوان منداڵ و دایک و باوکی بدەین، چونکە ئەگەری زۆرە ئەو پێداویستییە دەرئەنجامی لاوازیی ئەو هاوبەندییە بێت.

خەوتن لەگەڵ زاوا، ئامۆزای بە تەمەن گەورەتر، خاڵۆزا، کچی پوور با بۆ ماوەیەکی کاتییش بێت، دروست نییە، ئەمە هاوکات زیان بە سنوورە کەسییەکانی ئەو منداڵەش دەگەیەنێت.

ڕەنگە منداڵ بە حوکمی تەمەنەکەی، هێشتا فێری ئەوە نەبووبێت کە خەوی شەوان ڕووبەرێکی تایبەتی ژیانی تاکەکانە. بۆیە لەوانەیە بەئاسانی نەتوانین هاوسەنگی بپارێزین لە نێوان پێداگریی منداڵ لە سەر پێکەوە خەوتن و نەڕەنجاندنی، لەگەڵ دروستکردنی ئەو هۆشیارییەی کە هەر کەسە و ڕووبەرێکی تایبەتی هەیە نابێت لەلایەن کەسانی ترەوە پێشێل بکرێت. سەرەتا گرنگ ئەوەیە منداڵ هەست نەکات پەراوێز خراوە، بەڵام دواتر لە نزیکترین دەرفەتدا دەبێت دەربارەی (تایبەتمەندیی ژیانی خێزانەکان) زانیاریی بدرێتێ و ئاگادار بکرێتەوە لەوەی دروست نییە لە ژووری خەوتنی کەسانی تردا بخەوێت با خزم و کەسوکاریش بن.

> **کاتێک ژن و مێرد لە ژووری خۆیان لە سەر جێگەی خۆیان پاڵ کەوتوون، دروست نییە هیچ کەسێکی تر (برازا، خوشکەزا، خاڵۆزا و پوورزا..) لەو ژوورەدا بخەوێت.**

> **ئەگەر منداڵ زۆر حەزی کرد لای گەورەکانی خێزانەکەی بمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی خەوی لێدەکەوێت ڕێگەی پێ دەدرێت.**

### ئایا دروستە منداڵ بۆ خەو لە ماڵی خزم یان ماڵی هاوڕێی بمێنێتەوە؟

منداڵی خوار تەمەن (٤) ساڵ، دروست نییە لای هیچ خێزانێکی تر بمێنێتەوە. ئەمە تەنها لە ڕوانگەی مەحرەمیەتەوە گرنگ نییە، بەڵکو لە

ڕووانـگەی پێکهـاتنی هاوبەنـدییە عاتیفییەکـانی ئەو منداڵەشـەوە لەگەڵ خێـزانەکەی خۆیـدا گـرنگە. جـاری وایە حـاڵەتی نەخۆشـی یـان گەشـتی دوورودرێژ دێتە ئاراوە، لەو حاڵەتـانەدا لەبـری ئەوەی منـداڵەکە بەتەواوەتـی لای خێزانێـک دابنرێـت و شـەو و ڕۆژ لای ئەوان بمێنێـتەوە، باشـتر وایە لەگەڵ دایکی یان باوکی پێکەوە بمێننەوە. زۆر ناخۆشـە بـۆ منـداڵی خـوار تەمەن (٤) ساڵ، دایک و باوکی بە جارێك جێی بهێڵن.

زووترین کـاتیش دوای تەمەنـی (٤)سـاڵییە، کە دەتوانێـت بـۆ خەو لای خزمێکی بمێنێتەوە. تا دەگاتە تەمەنی (٧)ساڵییش نابێت ئەو مـانەوەیە لە (١) ڕۆژ زیاتر بێت.

> **منداڵ تەنها لە دوای تەمەنی (٧) ساڵییەوە ڕێگەی پێ دەدرێت لە دەرەوەی خێزان شەو بەسەر ببات، ئەویش تەنیا یەک شەو.**

شـەو بەسـەربردنیش لە دەرەوەی خێـزان، تەنها لە دوای تەمەنی (٧) سـاڵییەوە، ئەویـش تەنها یەک جار ڕێگەپێدراوە. ئەو شوێنەشـی لێـی دەمێنێـتەوە، دەبێـت شـوێنێک بێـت ڕەچـاوی پەروەردەی سێکسـی و ڕێسـاکانی مەحرەمیەتی تێدا بکرێت.

پـێکەوە خەوانـدنی پـوورزا و خـاڵۆزا و ئامۆزا و جێهێشتنی منداڵ لای خزمی لە خۆی گەورەتر، ڕەفتارێکی هەڵەیە.

**ئایا دروستە لە بۆنە و ئاهەنگ و پشووەکاندا، بە هۆی نەبوونی جێگەوە ئەندامانی خێزان پێکەوە لە ژوورێکدا بمێننەوە؟**

زۆر جار لە بۆنە و کۆبـوونەوە خێزانییەکانـدا، بـۆ خەوتـن گەورەکـان لە جێگەیەکدا و منداڵەکانیش بەجیا لە جێگەیەکی تردا دەخەوێـنن، لە ڕاسـتیدا ئەوەش بۆخۆی هەڵەیەکی گەورەیە لە ڕووی پێدەگۆژییەوە.

ئەو هاوتەمەنانەی پێکەوە لە یەک ژووردا دەمێننەوە، ڕەنگە لە ژێر کاریگەریی ئەو بۆنەیەدا کە بەشدارییان تێدا کردووە، ڕەفتاری نائاسایی بەرامبەر یەک بنوێنن و سنوورە کەسییەکانی یەکتر ببەزێنن.

> **لە حاڵێکدا ئەگەر پێویستی کرد ئەندامانی خێزان لە یەک ژووردا بخەون، پێویستە دایک و باوک منداڵەکان لە نێوان خۆیاندا بەش بکەن.**

پێشنیارمان بۆ ئەو دایک و باوکانەی کە ناچارن لە شوێنێکی بچووکدا شەو بەسەر بەرن ئەوەیە، لە نێوان خۆیاندا منداڵەکانیان دابەش بکەن.

ئەگەر ناچار بوون لە هەمان ژوور و لە سەر هەمان جێگە بخەون، وا باشە دایک و باوک منداڵەکانیان بخەنە نێوان خۆیانەوە.

## ئایا تا چەند دروستە دایك و باوك لە ناو ماڵدا بە جلی ژێرەوە بسووڕێنەوە؟

سووڕانەوەی دایک و باوک لە ناو ماڵدا بە جلی ژێرەوە، هەم لە ڕووانگەی سنوورە کەسییەکانی خۆیشیان و منداڵەکانیشیان شتێکی پەسەند نییە.

تەنانەت دەبێت دایک و باوک بەرامبەر ئەو وێنە و ڕیکلام و فیلمانەش هەستیار بن، کە دیمەنی ڕووت و ئاماژەی سێکسیان تێدایە.

> **پێویستە منداڵ دایک و باوکی لە ڕێگەی کەسێتییەکەیەوە بناسێت، نەوەک ناسنامە سێکسییەکەی.**

پێویستە منداڵ دایک و باوکی لە ڕێگەی کەسێتییەکەیەوە بناسێت، نەوەک ناسنامە سێکسیەکەی. پێویستە دایکان و

باوکـان لە هەمـوو جـۆرە بارودۆخێـک دوور بـکەونەوە، کە بـۆنی بزوانـدنی هەسـتی سێکسیان لێدێت.

نابێت منداڵ ڕووبەڕووی حاڵەتێـک ببێتەوە، کە لێیەوە ئاگـاداری ژیـانی سێکسیی دایـک و باوکی بێت. قسـەکردن لە پێکهـاتەی جەستەیی ژن و پیاو، نابێت ببێتە دەلاقەیەک بۆ چوونە نـاو بابەتە سێکسییەکانەوە. بەپێچەوانەوە، دەبێت جەخـت لە سـەر ئەوە بکەیـنەوە کە "جەسـتە و لەشـولاری هەریەکەمـان تـایبەتە بە خـۆی" و حەزکـردن بە بینینـی جەستەی کەسێکی تر، بێڕێزی نوانـدنە بەرامبەر ئەو کەسـە. بەو شـێوەیە هەر لە منداڵییەوە فێر دەبێت تەماشای لەشولاری کەسانی تر نەکات و بە خەیاڵ بیریـان لێ نەکاتەوە.

> “
> **دایکان و باوکان نابێت هەڵوێستێک بنوێنن، ژیانی سێکسیی خۆیان بدەن بەدەستەوە.**
> ”

ئەو دایک و باوکانەی بە جلی ژێـرەوە بە نـاو ماڵـدا دەگەڕێـن، دەبێـت ئەوە بزانن کە ئەو ڕەفتارەیان دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ بیر لە جلـی ژێـرەوەی کەسـانی تریش بکاتەوە و لە خەیاڵی خۆیدا وێنایان بکات.

پۆشـینی دایکـان و باوکـان بەگوێرەی دونیابینی و تەرزی ژیانیـان، کار دەکاتە سەر بەهێزبوونی کەسێتیی منداڵەکانیان.

زۆر گرنگە منداڵ لە ناو ماڵیشـدا -نەک تەنیـا لە دەرەوە- دایـک و باوکی بە جلی ڕێکوپێکەوە ببینێت.

> “
> **ئەو دایک و باوکانەی بایەخ نادەن بە جلوبەرگی ماڵەوەیان و تەنیا بۆ دەرەوە خۆیان دەڕازێننەوە، کاریگەریی نەرێنییان لە سەر منداڵەکانیان دەبێت.**
> ”

## ئایا لە کاتی ناچاریدا دەتوانین ژوورەکەمان بە پەردە بکەین بە دوو بەشەوە؟

نەخێر، گونجاو نییە.

دەتوانین بڵێین پەروەردەی سێکسی -لە ڕوویەکەوە- پڕۆسەی زوو بەئاگانەهێنانەوەی پەرۆشیی منداڵە. جیاکردنەوەی ژووری منداڵ بە پەردە بۆ ئەوەی یەکتری نەبینن (لەو تەمەنەدا (پێش تەمەنی ۷ ساڵی) کە هێشتا پێیان نەناوەتە قۆناغی گەشەی سێکسییەوەو بەگوێرەی ئەو شتانە کچ و کوڕ لەیەک جیا ناکەنەوە، نەک هەر یارمەتیی گەشەی سێکسییان نادات، بگرە پەرۆشییان بۆ دروست دەبێت و حەز دەکەن بزانن ئەوی تریان لەودیو پەردەوە خەریکی چییە.)

خۆ ئەگەر دوای تەمەنی (۷) ساڵییش، هەر یەک ژوور بەکار دەهێنرا، ئەوا لانی کەم با لە کاتی جلگۆڕیندا ئەوی تریان بچێتە دەرەوە.

بەکارهێنانی پەردە بەتایبەتی لە جیاکردنەوەی ژوورێکدا کە خوشک و برا تیایدا دەمێننەوە، کارێکی پەسەند نییە، چونکە خولیای ئەوەیان بۆ دروست دەبێت لەشولاری یەکتر ببینن.

> پەروەردەی سێکسی، پڕۆسەی زوو بەئاگانەهێنانەوەی خولیای منداڵە بۆ بابەتە سێکسییەکان.

لەو حاڵەتانەشدا کە خوشک و برا تەمەنیان گەیشتووەتە (۱۰) ساڵی و هێشتا لە یەک ژووردا دەمێننەوە، پێشنیاری ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەین:

«- پێویستە لەکاتی جلگۆڕیندا بەتەنیا بن.

- پێخەفیان جودا بێت.

- شوێنی جلوبەرگ و کەلوپەلەکانیان جیاواز بێت.

- ڕەچاوی گونجاویی جلوبەرگیان بکەن.»

## ئایا پێویست دەکات دەرگای ژووری دایک و باوک بەردەوام داخراو بێت؟

بەدەر لە کاتی جلگۆڕین و ساتە تایبەتەکان، پێویستە دەرگای ژووری دایک و باوک کراوە بێت.

لە تەمەنی (٤) ساڵییەوە، دەبێت ئەوە فێری منداڵ بکرێت کە ئەگەر دەرگای ژووری نووستن داخراو بوو، مانای وایە یەکێک لە ژوورەوە جلەکانی دەگۆڕێت، لەمەوە فێری ئەوە دەبێت کە ئەویش جلەکانی گۆڕی پێویستە دەرگای ژوورەکەی بەکراوەیی جێ نەهێڵێت، ئیتر کە دەبینێت دەرگای ژوورێک داخراوە، تێدەگات ئەوانەی لە ژوورەوەن، بەردەست نین و سەرقاڵن.

هەروەها دەبێت لە تەمەنی (٤) ساڵییەوە منداڵ بەکردەیی فێری ئەوە بکرێت پێش چوونە ژوورەوە لە دەرگا بدات، تا مۆڵەتیشی پێ نەدرێت، خۆی نەکات بەژووردا.

بەدەر لە کاتە تایبەتەکان، پێویستە دەرگای ژووری دایک و باوک کراوە بێت.

دوای ئەوەی منداڵمان لەسەر ئەو جۆرە پەروەردەیە ڕاهێنا، ئیتر دەتوانین دەرگای ژووری نووستنەکان تا نیوەی بەکراوەیی جێ بهێڵین.

> **پێویستە دایکان و باوکان ڕەچاوی منداڵەکانیان بکەن لە کاتی لەبەرکردنی جلی تایبەتی خەوتندا، بە جۆرێک نەبێت منداڵەکانیان بیانبینن.**

منداڵ بەگوێرەی قۆناغی گەشەکردنەکەی، چەندین بیروبۆچوونی هەمەجۆری لا دروست دەبێت سەبارەت بەو ژوورانەی بەردەوام دەرگاکانیان داخراوە؛ منداڵی بچووک وا هەست دەکات نەویستراو و ڕەتکراوەیە، هەرزەکاریش خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێت دایک و باوکی خەریکی سێکس بن.

١١ پێویستە دایکان و باوکان بۆ بەسەربردنی ساتە تایبەتییەکانیان، چاوەڕێی خەوتنی منداڵەکانیان بکەن، بەو جۆرە منداڵ هەست ناکات دەرگای ژووری دایک و باوکی داخراوە.

هاوکات پێویستە ڕەچاوی جلی خەوتن بکرێت، دەبێت دایکان و باوکان هەستیار بن بەرامبەر ئەوەی منداڵەکانیان بە جلی تایبەتیی خەوتنەوە نەیانبینن.

وەک دەزانن پەروەردەی سێکسی لە سەر بنەمای پەرۆشنەبوونی بۆ ژیانی تایبەتی کەسانی تر بنیات نراوە، لەو ڕووەوە منداڵ دەبێت ئەوەندە هۆشیاریی لای دروست بووبێت کە بزانێت جلی ناو کانتۆری دایک و باوکی تایبەتە بە خۆیان و بەشێکە لە سنوورە کەسییەکانیان. بەتایبەت جلی ژێرەوە دەبێت لە جێگەیەکدا بێت، منداڵ نەتوانێت بەئاسانی دەستی پێیان بگات. کاتێکیش دەیانەوێت جلەکانیان بشۆن، دەبێت هەمان هەستیاری بنوێنن، هەر لەو ساتەوە کە جلەکانیان دەخەنە ناو سەبەتەی شوشتنەوە، تاوەکو ئەو کاتەی بە جلشۆر دەیانشۆن و وشکیان دەکەنەوە. بە هیچ جۆرێک نابێت کوڕی پێگەیشتوو؛ جلی باوکی و کیژی پێگەیشتووش؛ جلی دایکی بەکار بهێنێت. ١٢

**بە هیچ شێوەیەک نابێت منداڵ جلی دایک و باوکی بەکار بهێنێت، با بەبەریشی بێت و خاوێنیش بێت.**

## ئاساییە منداڵ دایك و باوكی ببینێت، كاتێك خۆشەویستی بۆ یەكتری دەردەبڕن؟

زۆر ئاساییە.

زۆر ئاساییە منداڵ دایک و باوکی ببینێت سۆز و خۆشەویستی بۆ یەکتری دەردەبڕن، بگرە سوودیشی هەیە. بەڵام بە مەرجێک؛ ناوەڕۆکی هاودەمییەکەیان سێکسی نەبێت.

منداڵ دڵخۆش دەبێت بەوەی دایک و باوکی یەکتریان خۆش بوێت. ماچکردنی ڕوومەت لە ساتەوەختیماڵئاواییدا، لەباوەشگرتن لە گەڕانەوەدا، دەست خستنە ناو دەستی یەک و گۆڕینەوەی پەیڤی ئەویندارانەی دایک و باوک کە پێکەوە دادەنیشن؛ سەرچاوەی پێگەیشتنی منداڵە.

بەڵام دروست نییە ئەو جۆرە ڕەفتارانە لە بەرچاوی ئەواندا بنوێنین، کە پاڵنەرەکانیان حەز و ئارەزووی سێکسین و جەستەین.

بۆ نموونە؛ کاتێک باوک لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و ماڵئاوایی دەکات، زۆر ئاساییە ماچی هاوسەرەکەی بکات، بەڵام ئەگەر بە هەستێکی سێکسییەوە ئەو کارە بکات، لە سۆنگەی منداڵەوە ڕەفتارێکی پەسەند نییە. بەهەڵەدا چووین ئەگەر وا بیر بکەینەوە: "منداڵە، چی تێدەگات!" بۆ دایک و باوک خۆشیان خۆش نییە لای منداڵەکانیان هەستی سێکسییان هەبێت.

> دەربڕینی خۆشەویستی لە نێوان دایک و باوکدا، سوودی بۆ منداڵەکانیان هەیە.

هاوشێوەی ئەوە، منداڵ هەست بە ئاسوودەیی دەکات کە دەبینێت دایک و باوکی بەخۆشەویستییەوە بۆ یەکتری دەڕوانن و نیگای پڕ سۆز و ئەوین پێشکەشی یەکتری دەکەن، بەڵام ناتوانین هەمان شت بڵێین کاتێک هەستی سێکسی دێتە ناو مەسەلەکەوە. نابێت

منداڵ دایک و باوکی بە ڕوخسارێکەوە ببینێت کە هەستی سێکسیی تێدا بێت، ڕووخساری دایک و باوک دەبێت هەمیشە سۆز و خۆشەویستیی بیر بخاتەوە نەوەک شتی تر.

## چی بکرێت باشە، کاتێک منداڵ دایک و باوکی لە ناو حاڵەتە تایبەتییەکانی نێوان ژن و مێرددا دەبینێت؟

کاتێک منداڵ دێت بە سەر حاڵەتێکی تایبەتیی دایک و باوکیدا، سەرەتا پێویستە بەوپەڕی هێمنییەوە داوای لێ بکەن بچێتە دەرەوە تاکو لەوە زیاتر تووشی شۆک نەبێت. قیڕاندن و خۆشڵەژاندن و تووڕەبوون، دیمەنەکە زیاتر لە یادگەیدا دەچەسپێنێت.

ئەگەر منداڵەکە هێشتا نەچووبووە قۆناغی هەرزەکارییەوە، ئەوا هیچ پێویست ناکات مەسەلەکە گەورە بکەین، چونکە جارێ نازانێت چی دەگوزەرێت. بەپێچەوانەوە، کاردانەوەی توند دەبێتە هۆی ئەوەی گرفتی ناوەکیی بۆ دروست بێت و هەوڵ بدات بزانێت چی ڕووی داوە، لەبەر ئەوە لەسەرخۆیی و هێمنیی باشترین شتە بۆ ئەو حاڵەتانە.

خۆ ئەگەر لە قۆناغی هەرزەکاری و دواتردا بوو، دیسانەوە پێشنیاری لەسەرخۆیی و هێمنی دەکەین، پەیوەندیت نەبێت بەسەریەوە کاتێک بەشەرمەوە لە ژوورەکە دەچێتە دەرەوە. نابێت یەکسەر ئەوانیش بێنە دەرەوە و بچن بۆ لای منداڵەکە، وازی لێ بێنن با کەمێک بەتەنها بمێنێتەوە، لەوانەیە حەز بکات بچێتە دەرەوە پیاسەیەک بکات یان لە ژوورەکەی خۆیدا

> پێویستە کاردانەوەی کتوپڕمان نەبێت لە حاڵەتە نەخوازراوەکاندا، چونکە شوێنەواری قووڵ لە زیهنی بەرامبەردا دروست دەکات.

بخەوێت، مۆڵەتی بدەن با خۆی لەو دۆخە بێتە دەرەوە کە تووشی پەشۆکانی کردووە. دەبێت زۆر ئاسایی بێت بە لایانەوە ئەگەر بۆ ڕۆژی دواتر حەز نەکات قسەیان لەگەڵدا بکات، پێویست ناکات زۆر لەسەری بڕۆین و بابەتەکە بکەینەوە.

**خۆی بەشەرمەوە ژوورەکە جێ دەهێڵێت، پێویست ناکات ئێمە هیچی پێ بڵێین.**

نە دەبێت منداڵ خەتابار بکرێت، نە دەشبێت دایک و باوک وەک خەتابار مامەڵە بکەن. ڕەنگە منداڵ تا ماوەیەک قسەیان لەگەڵدا نەکات، لەم بارەدا پێویستە دایک و باوک بەردەوام بن لە قسەکردن لەگەڵی -کەمتر لە جاران- و ژیانی ئاسایی خۆیان بەڕێ بکەن.

**کاتێک منداڵ دایک و باوکی لە حاڵەتێکی نەخوازراودا بینی، نە پێویست دەکات ئەوان خۆیان بە خەتابار بزانن، نە پێویستیش دەکات منداڵەکەیان خەتابار بکەن.**

پێویست ناکات دایکان و باوکان خۆیان بەناچار بزانن ڕوونکردنەوە بدەن بە منداڵەکەیان.

چەندە زوو بچنەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیان، ڕووداوەکە ئەوەندە کاریگەریی کەمتری دەبێت.

## چی بکەین ئەگەر منداڵ چاوی بە کەلوپەل و شتە تایبەتییەکانی دایك و باوکی کەوت؟

جلوبەرگ و ئەو کەلوپەلە تایبەتییانەی دایک و باوک بەکاری دەهێنن، نابێت لە بەرچاو و بەربلاو بن. نابێت منداڵ خەیاڵی بچێت بۆ لای سێکس، کە شتە تایبەتەکانی دایک و باوکی دەبینێت.

منداڵی پێش هەرزەکاری ،ئەگەر چاوی بەو کەرەستانە کەوت کە دایکی بۆ پاکژی بەکاریان دەهێنێت و دەربارەیان پرسیاری کرد، دایکی دەتوانێت بەم جۆرە بۆی ڕوون بکاتەوە: "کەرەستەیەکە بۆ خاوێنی جەستەم بەکاری دەهێنم." ئەگەر منداڵەکە کچ بوو، ئاساییە زانیاریی زیاتری بدەینێ بێ ئەوەی بچینە ناو وردەکارییەکانیەوە. ئەگەر کوڕ بوو، هەر ئەوەندە بڵێین: "کەرەستەیەکی تایبەتە بە دایکت" و بابەتەکە دادەخەین.

خۆ ئەگەر هاتوو پرسیاریان دەربارەی ئەو کەرەستانە کرد کە بۆ خۆپاراستن لە سکپڕی بەکار دەهێنرێن، پێویست ناکات بچینە ناو وردەکارییەکانەوە و ئەوەندە بەسە پێیان بڵێین کەرەستەی تایبەتیی پزیشکین بۆ تەندروستی بەکار دەهێنرێن.

کاتێکیش ویستیان یاریی پێ بکەن، دەتوانین بیریان بخەینەوە کە کەرەستەی تایبەتیی کەسانی تر هی یاریکردن نییە.

منداڵانی قۆناغی هەرزەکارییش بەگشتی شەرم دەکەن پرسیار دەربارەی ئەو شتانە بکەن، ئەگەرچی بەدیاریکراوییش نەزانن بۆچ شتێک باشە، بەڵام پێشبینی دەکەن بۆ ئەو کارانە بەکار دێت، یان لەوانەیە بزانن بۆیە ناپرسن. پرسیارنەکردنی منداڵ، نابێت وا لە دایک و باوک بکات بە ئارەزووی خۆیان بجووڵێنەوە.

**ئاساییە وەڵامی پرسیاری ئەو منداڵانە بدرێتەوە کە پەرۆشی کەلوپەلە تایبەتییەکانی دایک و باوکیانن، بە مەرجێک وردەکارییەکانی باس نەکرێت.**

## ئایا دروسته دەرگای تەوالێتی باخچەی ساوایان کراوە بێت؟

نەخێر، هەڵەیە.

بەشێک لە پەروەورشیاران پێیان وایە کراوەیی دەرگای تەوالێت لە باخچەی ساوایاندا، پەرۆشیی منداڵان بۆ ڕەگەزی بەرامبەر دەڕەوێنێتەوە.

بەڵام بیرمان نەچێت، تەوالێت ڕووبەرێکی تایبەتە، پرۆسەکەش داخوازی تەنیاییە.

کراوەیی دەرگای تەوالێت هیچ سوودێکی بۆ گەشەی سێکسی جەستەیی منداڵ نییە، بگرە زیانیشی هەیە. هەرکێ دێت و دەڕوات بەو ناوەدا، دەیبینێت.

منداڵ بەوە پەرۆشییەکەی ناڕەوێتەوە ئەندامی زاووزێی ڕەگەزی بەرامبەر ببینێت، بگرە بەوە سەرسامییەکەی زیاتر دەبێت، دەچێت بەدوای ئەو جیاوازییەدا، هەوڵ دەدات لە نزیکترەوە ئەو جیاوازییە ببینێت.

تەنانەت دەکەوێتە بەراوردکاری لە ناو ئەندامانی خێزانەکەشیدا، جیاوازیی کوڕ و کچ لە سەر دایک و باوک و خوشک و براکانی تاقی دەکاتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کارێکی لەو جۆرە (بچیت ئەندامی زاووزێی منداڵێک نیشانی منداڵێکی تر بدەیت، ئەمە چییە پەرۆشە بۆی!) بە دەستدرێژی دادەنرێت بۆ سەر ئەو منداڵەی ئەندامەکانی بینراوە.

> تەوالێت ڕووبەرێکی تایبەتە، پێویستە دەرگاکەی داخرابێت، جا لە باخچەی ساوایاندا بێت یان هەر شوێنێکی تر.

کاتێک منداڵ بەتەنیا پێداویستیی تەوالێتی بەجێ دەهێنێت، لە هەمان کاتدا فێری پاراستنی سنوورە کەسییەکانی خۆیشی دەبێت، ئەوەش خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی گرنگە بە ئاڕاستەی خۆپاریزی بەرامبەر گێچەڵ و دەستدرێژیی سێکسی.

**لە دەزگـا پەروەردەییەکـانی پـێش قۆنـاغی قوتابخـانەدا ئەگەر منـداڵێك خـۆی پـیس بکـات، هەر لە نـاو پۆلـدا دەیگۆڕن. ئەمە تا چەند دروستە؟**

ئەگەر بە هۆی هەر شتێکەوە بێت منداڵ خۆی تەڕکرد یان ئارەقەی زۆری کردەوە، دروست نییە لە ناو پۆلدا جلەکانی بگۆڕدرێت.

جەستەی منداڵ هی خۆیەتی، پێویستە بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. ئەو منداڵەی خۆی پیس کردووە و دەبێت جلەکانی بگۆڕێت، سـەرەتا دەبێت ببرێتە ژوورێک کە هەست بە دڵنیایی بکـات، ئینجا دەرفەتـی ئەوەی پێبدرێت خۆی جەلکانی بگۆڕێت.

ژوورەکەش نابێت پەنجەرەکـانی ڕوون بـن و لە دەرەوە ببینرێـت. هەمـوو ئەم هەنگاوانە، لە ڕووانگەی دروستبوونی سنوورە کەسییەکانی منداڵەوە زۆر گرنگن. ئەگەر خۆیشی نەیتوانی جلەکـانی بگۆڕێـت، ئەوا یـارمەتیی دەدەیـن، بەڵام هەر دەبێـت هەنگاوبەهەنگـاو فێـری ئەوەی بکەیـن چـۆن جلەکانی بگۆڕێت.

> پێویستە منداڵ لەبەرچاوی کەسانی تردا خۆی نەگۆڕێت.

هەندێك جـار لە کـاتی دیـاریکراوی خەودا، داوا لە منـداڵەکان دەکرێـت بیجامەکانیـان بگـۆڕن، لە کاتێکـدا دروست نییە بەکۆمەڵ بیجامەکانیان دابکەنن.

لە هەمـان کاتـدا، ئەوەش هەڵەیە پەلەپەلیـان لـێ بکرێـت، چـونکە منـداڵ (شـت) نییە بەپەلە و بـێ بایەخپێدان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

**لە قۆناغی پێش قوتابخانەدا، هەندێك جار منداڵان دەست دەدەن لە ئەندامی زاووزێی یەکتر و دەستبازی دەکەن، ئەمە تا چەند کێشەیە؟**

لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانەدا، حەز و خولیاکانی منداڵ بێسنوورن، هەموو شتێک بۆ ئەو وەک یاری وایە، شتێک نییە پەرۆشیی بۆی نەجووڵێت، هەر لە دەرزی و پەتەوە تا دەگاتە چەقۆ و ئاگر. منداڵانی ئەو تەمەنە وا دەزانن هونەرە، ئەگەر پانتۆڵی خۆیان یان یەکتری دابکەنن و نیشانی یەکتری بدەن. لە ڕاستیدا ئەو جۆرە ڕەفتارانە جگە لە ڕەفتاری بێخەوشیی منداڵانە، هیچی تر نین، بۆیە نابێت وەها لێکی بدەینەوە کە مەبەستی سێکسییان تێدایە یاخود دەستدرێژین.

منداڵ بەسروشت حەزی لە دووبارەکردنەوەی ئەو هەڵسوکەوتانەیە کە لە هاوڕێکانیەوە دەیبینێت، یان دەزانێت کەسانی دەوروبەری دەخاتە پێکەنین. جاری وایە لە دەزگا پەروەردەییەکانی پێش قوتابخانەدا، منداڵان دەست بۆ ئەندامی زاووزێی یەکتری دەبەن و ماچی یەک دەکەن، ئاسوودە بن، هی ئەوە نییە بکرێت بە کێشە، چونکە لە ڕێگەی پەروەردەی دروستەوە چارەسەر دەبێت و فێری ئەوە دەبن کە دەستدان لە جەستەی کەسانی تر ڕەفتارێکی دروست نییە.

> **پەرۆشیی منداڵانە، هەستی سێکسی تێدا نییە.**

لە کاتی بینینی ئەو جۆرە دیمەنانەدا، پێویست ناکات خۆمان تووڕە بکەین و هەڕەشەیان لێ بکەین، چونکە ئەو هەڵوێستەی ئێمە شوێنەوای نەرێنی لە زیهنیاندا جێ دەهێڵێت، کە لە خودی ڕەفتاری منداڵەکە خراپترە.

دەستلێدانی منداڵان لە یەکتری، ئەگەر هەستی سێکسیی تێدا نەبێت، هیچ زیانێک بە پەروەردەی مەحرەمیەت ناگەیەنێت.

## ئایا تا چەند ڕاستە بە شێوەی کۆمەڵ پەروەردەی سێکسیی بدرێت بە منداڵ؟

هەرگیز دروست نییە کۆمەڵێک منداڵ لە جێگەیەکدا کۆ بکەیتەوە و باسی پەروەردەی سێکسییان بۆ بکەیت.

گرنگ نییە هاوتەمەن بن یان نا، چونکە پێداویستیی هەریەکەیان بۆ زانیاریی سێکسی جیاوازە لەوی تریان، ڕەنگە هی وایان تێدا بێت لە تەمەنیدا وشەی سێکسی بەرگوێ نەکەوتبێت، هی واشیان تێدا بێت خولیای وردەکارییەکانی بێت، لەوانەیە هەندێکیان بە بیستنی بابەتەکە لە شەرمدا سوور هەڵبگەڕێن، هەندێکی تریشیان کەیفیان پێی بێت و پێکەنینیان بێت. بە هۆی جیاوازیی پێکهاتەی خێزانیی هەریەکێکیان لەوی تریان، بەشێکیان شەرم دایاندەگرێت، بەشێکی تریشیان حەز دەکەن شتی زیاتری لە سەر بیستن.

ئەمە وێڕای ئەوەی قسەکردن دەربارەی تایبەتترین هەستی ژیانی مرۆڤ، داخوازی بەکارهێنانی شێوازێکی هەستیار و کەشێکی تایبەتە. تەنانەت ئەگەر منداڵ پرسیارێکیشی لا دروست ببێت، ڕووی نایەت لە ناو ئەو قەرەباڵغییەدا بیکات.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێویستە پەروەردەی سێکسی، تایبەتی بێت (لە نێوان منداڵ و کەسێکی پێگەیشتوودا) و، زانیارییەکانیش بە زمانێکی هەستیار و بەگوێرەی پێداویستیی منداڵەکە بخرێنە ڕوو.



**پەروەردەی سێکسی چالاکییەک نییە بەکۆمەڵ ئەنجام بدرێت، بەڵکو بابەتێکی دوو لایەنەیە لە نێوان منداڵ و کەسێکی پێگەیشتوودا.**



دەبێت ئاگاداری خاڵێک بین: پێدانی زانیاریی سێکسی بە منداڵێک کە هێشتا

پێویستییەکی ڕاستەقینەی بەو زانیارییانە نییە، دەبێتە مایەی پەرۆشی و خولیایەکی کۆنترۆڵنەکراو لە هەندێکیاندا، هەندێکی تریشیان وێنەی ئەو کەسەیان لە بەرچاو دەشێوێت کە ئەو شتانەیان لێوە بیستووە.

## چ کاتێك گونجاوە هەواڵ بدرێت بە منداڵ، کە خوشکێك یان برایەکی دەبێت؟

بۆ منداڵی خوار تەمەن (١٠) ساڵ، وا باشە کاتێک هەواڵی پێ بدرێت کە گۆڕانکارییەکانی جەستەی دایک خەریک بوو وردەوردە لە دەرەوە هەستیان پێ دەکرا، ئەمەش بەنزیکەیی دەکاتە مانگی (٧-٨)ەمینی دووگیانی.

لەبەر چەند هۆکارێک، پێویستە یەکسەر ئاگاداری نەکەینەوە:

منداڵ با خۆیشی لە بنەڕەتدا حەسوود نەبێت، کەچی کە هەواڵی لەدایکبوونی منداڵێکی تری پێ دەدرێت، هەموو هەڵسوکەوتێکی (هەڵە)ی دایک و باوکی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بەستەزمانەی کە هێشتا نەهاتووەتە دونیاوە، وا بیر دەکاتەوە کە ئیتر دایک و باوکی ئەمیان خۆش ناوێت و لەتاو براکەی/خوشکەکەی بەڕەقی لەگەڵیدا دەجووڵێنەوە و هەر گرنگی بەو دەدەن.

ڕاستە کە منداڵ هەواڵی لەدایکبوونی برایەکی یان خوشکێکی دەبیستێت، ڕەنگە یاوەریی دایک و باوکی بکات لە دەربڕینی شادمانیدا، بەڵام زەحمەتە بە درێژایی نۆ مانگی ڕەبەق بتوانێت شادمانییەکەی بەزیندەیی بهێڵێتەوە و نەگۆڕێت بۆ دڵەڕاوکە.

ئەمە جگە لەوەی کە نۆ مانگ چاوەڕێکردن،

**یەکێک لە هۆکارەکانی ئیرەیی نێوان خوشک و برا، دەگەڕێتەوە بۆ هەواڵپێدانی پێشوەختە.**

ماوەیەکی زۆر دووردرێژە بۆ منداڵ. لەو ماوەیەدا هەر ڕۆژە و پرسیارێک دەبێتە ماخۆلانی مێشکی: "براکەم کەی لەدایک دەبێت؟"، "بۆچی پێش ئەوە لەدایک نابێت؟"، "چۆن دێتە دونیاوە؟"... هتد.

> (9) مانگ چاوەڕوانی، ماوەیەکی دووردرێژە بۆ منداڵ.

بۆ ئەوەی یارمەتیی بدەین ئاسانتر هەستەکانی ئاڕاستە بکات و لە زووترین کاتدا کۆرپەی تازەلەدایکبوو بکاتە باوەشی، وا گونجاوە تا کۆتایی مانگی حەوتەم چاوەڕێ بکەین.

لە لایەکی ترەوە، مەرج نییە هەموو دووگیانییەک بە هاتنەدنیای منداڵ کۆتایی بێت، ئەگەری ئەوە لەئارادایە لە ئەنجامی لەبارچوون، منداڵ تووشی شۆکی دەروونی ببێت.

بەڵام پێویست ناکات ئەو ماوەیە بوەستین، ئەگەر ئەگەری ئەوە هەبوو منداڵ لە دەوروبەریەوە ببیستێت دایکی منداڵی دەبێت، چونکە بیستنی هەواڵێکی لەو جۆرە لە کەسێکی ترەوە، متمانەی منداڵ بە دایک و باوکی زامدار دەکات.

بۆ منداڵی سەروو تەمەن (١٠)ساڵیش وا باشە بێ دواخستن ئاگادار بکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەویش بەشداری خۆشی و شادیی باوانی بکات.

هەواڵی هاتنەدونیای منداڵی تازە، نابێت وەک هەر هەواڵێکی تری ئاسایی باس بکرێت. دەبێت لە کەشێکدا پێی بوترێت، کە دایە و بابە هەردووکیان ئامادە بن و تاکە تەوەری دانیشتنەکەشیان هەواڵی لەدایکبوونی منداڵە تازەکە بێت، باسکردنی ئەو هەواڵە گونجاو نییە لەو کاتانەدا بێت کە

منداڵ سەرنجی لای شتێکی ترە. وەک ئەو کاتانەی سەیری تەلەڤزیۆن دەکات یاخود سەرگەرمی یاریکردنە.

دەبێت هەواڵەکە بە ڕوویەکی خۆش و دەمبەخەندەوە ڕابگەیەنرێت. بۆ نموونە؛ دایک و باوک دەتوانن بەم شێوەیە دەست پێ بکەن: "گیانەکەم دەزانی چی، برایەکت دێتە دونیاوە!".

> ئەگەر منداڵ لە کەسێکی ترەوە ببیستێت کە برایەکی یان خوشکێکی دەبێت، متمانەی بە دایک و باوکی کەم دەبێتەوە.

**چی بکەین باشە بۆ ئەو حاڵەتی سکپڕییانەی بەنارەحەتی تێپەڕ دەبن؟**

بە هیچ شێوەیەک نابێت منداڵ وا هەست بکات نارەحەتی و ئازارەکانی دایکی لە پێش منداڵبوون، هۆکارەکەی ئەوەیە کە دووگیانە، چونکە دوور نییە براکەی/خوشکەکەی بە سەرچاوەی ئەو ئازارانە بزانێت و بەو هۆیەوە ڕقی لێ هەڵبگرێت.

بەدەر لەوە، ئەو منداڵە کیژانەی زۆر هۆگری دایکیانن، وا دەزانن چی بەسەر دایکیاندا هاتووە لە کاتی دووگیانیدا، لە ئایندەدا بەسەر ئەوانیشدا دێت، بۆیە ئەگەر هەیە لەو تەمەنەوە تۆوی ترس و دڵەڕاوکە لە عەقڵی نائاگایاندا سەوز ببێت.

بۆیە تا بکرێت ئازار و نارەحەتییەکان نەبەستینەوە بە دووگیانبوون و هاتنەدونیای خوشک و برای تازەوە.

لێکچوونی منداڵ لە دایکی یاخود باوکی، نابێت وەک ئامرازێک بۆ خۆهەڵکێشان باس بکرێت. باسکردنی لێکچوونی منداڵ و دایک و باوک، هەستێکی خۆش بە منداڵ دەبەخشێت و زیاتر هەست بە یەکپارچەیی خێزانەکەی دەکات.

## تا چەند ئاساییە منداڵ دایکی ببینێت شیر دەدات بە کۆرپەکەی؟

شیردان کاتێکی زۆر تایبەتە بۆ دروستبوونی هاوبەندی و سەرنجی نێوانی دایک و منداڵ.

تەماشاکردنی ئەو پرۆسەیە لەلایەن کەسێکی ترەوە، ڕێگر دەبێت لەوەی ئەو دایک و کۆرپەیە ئاوێتەی یەکتر ببن، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەش یەکێک بێت لە منداڵەکانی خۆیشی. بەدەر لەوە، منداڵی سەروو تەمەن (٤) ساڵ بە بینینی سنگی دایکی تووشی سەرسوڕمان دەبێت، ڕەنگە لە ئاکامی ئەوەدا هەوڵ بدات دەستی تێوە بدات و بیانووی شیر بگرێت.

ئەگەر هاتوو دایک لە ژوورێکی تەنیا و بێدەنگدا کە پلەی گەرمییەکەی لە پلەی گەرمیی جەستەوە نزیك بێت، شیر بدات بە کۆرپەکەی، ئەوا پەیوەندیی عاتیفیی نێوانیان زیاتر دەبێت. ئەگەر لەبەر ناچاری نەبێت، پەسەند وایە دایک لە کەشی قەرەباڵغ، یان بەدەم تەلەڤزیۆن و ئینتەرنێت و موزیکەوە شیر نەدات بە جگەرگۆشەکەی.

منداڵ کە شیر دەخوات، هەستەکانی لەسەر ڕیتمێکی هاوسەنگ ڕادەگرێت. ئەو هێزەشی بۆ کۆنترۆڵکردنی زیهنی پێویستیەتی، لە چاوی دایکی و هاوسۆزی و هاوهەستیی نێوانیانەوە وەریدەگرێت، واتە وەک ئەوە وایە مەشق لە سەر کۆنترۆڵکردنی هەستەکان و وردبوونەوە بکات. لەبەر

ئەوە شێواندنی سەرنجی منداڵ لە کاتی شیرخواردندا، دەبێتە هۆکاری کەموکورتی لە بواری بەدەستهێنانی سەرنج و وردبوونەوەدا.

> "سەرقاڵبوونی دایک لە کاتی شیرپێداندا سەرنجی کۆرپەکەی دەشێوێنێت."

ئەو منداڵانەش کە لە خوار تەمەنی (٦) ساڵەوەن و زۆر حەز دەکەن کرداری شیردان ببینن، دەتوانن چەند جارێک لە ژێر پەردەی شیرپێدانەوە سەیری دەموچاوی خوشک و براکانیان بکەن.

## "بۆچی خوشکەکەم وەك من گونی نییە؟"، چۆن وەڵامی ئەمە بدەینەوە؟

هەندێك جار کوڕان بە بینینی پێکهاتەی جەستەیی خوشکەکانیان، تووشی سەرسامی دەبن. یان لەوانەیە کچان هەمان هەستیان لا دروست بێت، کاتێك جەستەی براکانیان دەبینن، تەنانەت دوور نییە بشترسن.

سروشتی منداڵان وایە، شەرم ناکەن لەوەی بەڕاشکاوی گوزارشت لە سەرسامییەکانیان بکەن. بۆیە زووزوو گوێمان لێیان دەبێت پرسیاری لەم جۆرە دەکەن: "بۆچی خوشکەکەم ئەوەی نییە؟"، "ئەویای براکەم چیی لێ هاتووە؟".

هەڵەیە ئەگەر لە بەرامبەر ئەو جۆرە پرسیارانەدا تووڕە بین، یان بە وتنی: "جارێك تۆ منداڵی، ماوتە بۆ ئەو شتانە"، لەکۆڵ خۆمانی بکەینەوە. وەک چۆن ئەو بە دڵێکی پاکەوە پرسیاری کردووە، دەبێت بە هەمان شێوە دایک و باوکیش بە حاڵەتێکی ڕۆحیی هێمنانەوە سەرسامییەکەی بڕەوێننەوە: "کچان گونیان نییە، چونکە ئەوان بەو جۆرە دروست کراون. ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە، کوڕان بەو جۆرەن و کچانیش بەم جۆرە."

دایکـــان و باوکـــان دەبێـــت ڕاســـتبێژانە و لە دڵەوە وەڵامـــی پرســـیاری منـــداڵەکانیان بـــدەنەوە، کە ســـەبارەت بە خوشـــک و براکانیـــان لە ڕەگەزی بەرامبەر دەیکەن، بەو جۆرە ناهێڵن سەرسامییەکەیان بگۆڕێت بۆ پەرۆشـی و خولیای بەدواداگەڕان.

> **دایکان و باوکان دەبێت ڕاستبێژانە و لە دڵەوە وەڵامی پرسیاری منداڵەکانیان بدەنەوە، کە سەبارەت بە خوشک و براکانیان لە ڕەگەزی بەرامبەر دەیکەن.**

لە بارێکدا ئەگەر منـداڵ درێـژەی دا بە پرسـیارەکانی و ویسـتی لە سـەر دایـک و بـاوکی بەرجەسـتەیان بکـات، ئەوکـات دەبێت پێی بوترێـت: "قسـەکردن لە سـەر جەســتە و لەشــولاری کەســانی تــر، ڕەفتارێکی دروست نییە."

بیرمـان نەچێـت، مەرج نییـە منـداڵ پەرۆشی هەرشتێک بـوو، ئەو شتە بـۆ گەشەی باش بێت.

## تا چ ڕادەیەك ئاساییە منداڵی لەشیربڕاوە دەست بەرێت بۆ سنگی دایکی و ماچی بکات؟

**زۆر ئاساییە.**

ماوەیەکی دوورودرێـژ سـنگی دایـک سـەرچاوەی خـۆراک و تێرکردنـی منداڵ بووە، بۆیە دابڕان لەو سەرچاوەیە دڵتەنگی دەکات.

لە سـەرەتاکانی قۆنـاغی لەشـیربڕینەوەدا، منـداڵ هەسـت بە پێویسـتیی دەستتێوەدان و ماچکردنی سنگی دایکـی دەکـات. ئەو سـنگەی ڕۆژانێـک هـی خۆی بووە، بەڵام ئێستا ناتوانێت پێی بگـات. ئەو جـۆرە هەڵسـوکەوتانە ئاماژەن بۆ کۆتاییهاتنی قۆناغی شیرخواردن و وابەستەیی نێوان دایک و منداڵ.

بەتایبەتی ئەو منداڵانەی زیرەکیی عاتیفییان لە ئاستێکی بەرزدایە، لەو قۆناغەدا هەستیار و دڵتەنگ دەبن. لەبەر ئەوە نابێت بەیەکجارەکی لە سنگی دایکی داببڕێت، بەڵکو دەبێت بە شێوەیەک بێت کە بتوانێت دەستی لێ بدات و لە کاتی خەودا هەست بە گەرمیی پێستی بکات.

> “ شیرخواردنی تەندروست، بە دەستلێدانی سنگی دایک کۆتایی دێت. ”

نابێت منداڵ لەو تەمەنەدا بە شێوەیەکی یەکلایی و بڕاوە ڕێی لێ بگیرێت، دروست وایە ڕێگە بەو مەیلە ناوەکییانەی بدرێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بەر لە تەمەنی (٣)ساڵی، ئەو حەزانەی کۆتاییان پێبێت.

منداڵ بە ئەندازەی نزیکیی لە سنگی دایکیەوە هەست بە ئاسوودەیی دەکات. لەشیربڕینەوەش بە دەستلێدان کۆتایی دێت نەک بە شیرخواردن.

## منداڵ لە چ تەمەنێکەوە سەرنجی ئەوە بدات بچێتە تەوالێتی پیاوان یان خانمان؟

منداڵ لە تەمەنی (٤) ساڵیدا، هەردوو ڕەگەز لەیەک جیا دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە نازانێت سێکس چییە، بەڵام پێی خۆشە بە ناسنامەی سێکسیی خۆیەوە بناسرێتەوە.

> “ ئەگەر منداڵ لە تەمەنی (٤) ساڵییەوە تەوالێتی تایبەت بە ڕەگەزی خۆی بەکاربهێنێت، زووتر ناسنامەی سێکسی بەدەست دەهێنێت. ”

بۆیە وا باشە لە تەمەنی (٤) ساڵییەوە، تەوالێتی تایبەت بە ڕەگەزەکەی خۆی بەکار بهێنێت، چونکە یارمەتیی دەدات زیاتر یەکانگیر ببێت لەگەڵ ناسنامە ڕەگەزییەکەیدا.

جاری وا هەیە کوڕی سەروو تەمەنی (٤) ساڵ لەگەڵ دایکی دەچێتە تەوالێتی خانمانەوە، ڕاستە کێشە نییە، بەڵام ڕەفتارێکی پەسەندیش نییە، هەمان شت بۆ ئەو کچانەش ڕاستە کە لەگەڵ باوکیان دەچنە تەوالێتی پیاوانەوە.

لە دوای تەمەنی (٦) ساڵییەوە، پێویستە منداڵان تەوالێتی تایبەت بە ڕەگەزی خۆیان بەکار بهێنن.

## چ تەمەنێك گونجاوە بۆ خەتەنەکردنی کوڕان؟

باشترین کات بۆ خەتەنە، (٣) مانگی یەکەمی دوای لەدایکبوونە، چونکە زووتر چاک دەبێتەوە و منداڵەکەش کەمترین ئازاری پێ دەگات، بەدەر لەوەی کە کەمترین شوێنەواری دەروونییش جێ دەهێڵێت. خەتەنەکردن لە مانگەکانی یەکەمدا سوودێکی تریشی هەیە، کە ئەویش سوودوەرگرتنە لەو تایبەتمەندییە سارێژکەرەی کە میزی کۆرپە هەیەتی.

خۆ ئەگەر دەرفەتی ئەوە نەبوو، ئەوا دەبێت تا تەمەنی (٣) ساڵی کاری خەتەنەکردن تەواو بووبێت، چونکە لە دوای تەمەنی سێ ساڵ و نیوییەوە، جۆرێک لە سڕینەوەی یادگە بەسەر منداڵدا دێت و یادەوەرییە ناخۆشەکانی ڕابردووی بیر دەچێتەوە. جگە لەوەی کە دوای تەمەنی (٣) ساڵی، منداڵ دەست دەکات بە پرسیارکردن دەربارەی شتەکان و دەیەوێت بزانێت چی لەبەر چی ڕووی داوە، بۆیە ئەستەمە لەو تەمەنەدا لە باکگراوندی ئایینی و کلتووریی ڕووداوەکان تێبگات.

> **باشترین کات بۆ خەتەنەکردنی کوڕان، (3) مانگی یەکەمی دوای لەدایکبوونە.**

لە تەمەنی (٣-٦) ساڵیدا، هەستیاریی منداڵ بۆ جەستەی خۆی و ئازارەکانی زیاترە، پرسیارکردن دەربارەی شتەکانی ناو ژیان لەوپەڕی ئاستدایە،

بۆیە هیچ دوور نییە بەرهەڵستی بنوێنێت و لە دڵی خۆیدا بڵێت: "بۆچی واتان لێ کردم!"، چونکە هێشتا لەو ئاستەدا نییە لە واتای خەتەنەکردن تێبگات، ئەزموونە ناخۆشەکان لەم تەمەنەدا زۆر زوو لە زیهندا جێگیر دەبن، بۆیە وا باشە دوابخرێت بۆ دوای تەمەنی (٦) ساڵی.

> **لە تەمەنی (3-6) ساڵیدا، هەستیاریی منداڵ بۆ جەستەی خۆی و ئازار زیاتر دەبێت.**

بەڵام لە حاڵەتی پێویستدا یان لەو دۆخانەدا کە دواخستنی لە ڕووی پزیشکییەوە گرفتی دروست دەکرد، دەتوانرێت کردارەکە لە ڕێگەی بەنجی گشتییەوە بۆ منداڵانی تەمەن (٣-٦)یش ئەنجام بدرێت.

لایەنێکی تری گرنگ، بریتییە لە ئەنجامنەدانی کردارەکە بەبێ ئاگادارکردنەوەی منداڵەکە. جاری وایە لە سەروبەندی نەشتەرگەرییەکی تردا، بێ ئەوەی منداڵەکە ئاگادار بکرێتەوە خەتەنە دەکرێت، کە لەوانەیە دەرئەنجامی زۆر نەخوازراوی لێ بکەوێتەوە.

> **خەتەنەکردنی منداڵ لە کاتی بەنجکردنی بۆ نەشتەرگەرییەکی تر و هەواڵپێنەدانی، ڕەنگە شۆکی دەروونیی لێبکەوێتەوە.**

بۆ منداڵانی سەروو تەمەنی (٦) ساڵ، بەنجی گشتی پەسەند کراوە.

## ئایا سازکردنی مەراسیمی خەتەنە و ئاهەنگگێڕان بەو بۆنەیەوە لە ڕووانگەی زانستی پەروەردەی منداڵەوە دروستە؟

ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی خەتەنەوە، نەریتێکی کلتوورییە و سوودێکی پەروەردەیی نییە.

منداڵ وەک کارەکتەرێکی ناکارا لە ناوەڕاستی ئەو خەڵکەدا وەستاوە و
پیرۆزبایی ئەوەی لێ دەکرێت کە نەشتەرگەریی ئەنجام داوە، ئەمە شتێکە
تێگەیشتنی بە لای منداڵەوە زەحمەتە، تێناگات لەوەی بۆچی ئەو خەڵکە لە
بەرامبەر ئازارکێشان و نەشتەرگەریی ئەودا دڵیان خۆشە و خەریکی
ئاهەنگگێڕانن.

> ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی خەتەنەکردنەوە، هیچ سوودێکی پەروەردەیی نییە.

ئەمە جگە لەوەی ئەو پەیامە شاراوەیە دەدات بە ئاوەزی نائاگای ئەو منداڵە کە ڕەگەزی نێر ڕەگەزی باڵایە، چونکە وەک دەزانین ئەو جۆرە مەراسیمانە تەنیا بۆ کوڕان ئەنجام دەدرێت.

ئاهەنگی خەتەنە تەنیا سەر لە کوڕان تێک نادات، بەڵکو هەستی پەراوێزخرانیش لای کیژانی ناو ئەو خێزانەش دروست دەکات.

دەبینێت براکەی ئاهەنگی بۆ ساز دەکرێت و دیاریی پێشکەش دەکرێت و وێنەی لەگەڵدا دەگیرێت، ئیدی چۆن هەست بە پەراوێزخران نەکات!.

> مەراسیمی خەتەنەکردنی کوڕان، هەستی پەراوێزخران لای خوشکەکانیان دروست دەکات.

شێوازی دروست ئەوەیە، دوور بکەوینەوە لە هەموو چەشنە زیادەڕەوییەک. پێویست بە قەرەباڵغی و پۆشاکی گرانبەها ناکات، ئەوەندە بەسە پۆشاکێکی ئاسوودە لەبەر بکات و وێنەی یادگاری بگرێت و دوای خەتەنەکردنیش، هیوای تەندروستییەکی باشی بۆ بخوازرێت.

پێویستە منداڵ نەکەینە ئامرازی کەیف و سەفای کەسانی تر. دروستیش نییە کرداری خەتەنەکردن ببەستینەوە بە گەورەبوون یان بەوەی منداڵەکە لە ڕەگەزی نێرە، دەتوانین لە سەر سوودە تەندروستییەکانی

بوەستین. منداڵ هێشتا درکی بابەتە ئایینییەکان ناکات، بۆیە دروست نییە باسی ڕووە ئایینییەکەی بۆ بکرێت، چونکە لەوانەیە قەناعەتێکی نەرێنیی بەرامبەر ئاین بۆ دروست ببێت.

نابێت خەتەنە ببەستینەوە بە گەورەبوون یان نێرینەبوونەوە، کوڕان خەتەنە بکرێن و نەشکرێن هەر سەر بە ڕەگەزی نێرن.

جاری واشە ئاهەنگەکان دەبنە مایەی بەراوردکاری و خۆبەکەمزانین لای منداڵان، دەچن بەراوردی ئاهەنگەکانی خۆیان دەکەن بەوانەی هاوتەمەنەکانیان و نیگەران دەبن ئەگەر هەست بکەن شتێکی کەمتریان بۆ کراوە لەوەی هاوڕێکانیان.

## ئایا ختوکەدان و گازلێگرتن و پاڵخستنی منداڵ تا چەند ئاساییە؟

ماچکردن و دەستپێداهێنانی ئەندامی زاووزێی منداڵ دروست نییە، ئەوانە کۆمەڵە هەڵسوکەوتێکن کە گەشەی منداڵ پەک دەخەن و سنوورە کەسییەکانی پێشێل دەکەن.

لێسانەوە و پاڵخستن و ختووکەدانیش تا ڕادەی بێزارکردن، بە هەمان شێوە کۆمەڵە ڕەفتارێکی ناپەسەندن. ڕاستە گەورەکان بەو هەڵسوکەوتانە دڵخۆش دەبن، بەڵام هیچ پێداویستییەکی منداڵ پڕ ناکەنەوە.

کاتێك گەورەکان دەیانەوێت یاری لەگەڵ منداڵدا بکەن و خۆشەویستیی بۆ دەرببڕن، پێویستە پێداویستییەکانی ئەوان بخەنە پێش حەز و هەستەکانی خۆیانەوە، چونکە منداڵ ئامرازی دڵخۆشکردنی گەورەکان نییە.

پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان باوان و منداڵ دەبێت بە چەشنێک بێت، منداڵ هەست بکات ڕێزی لێ دەگیرێت.

بەزۆر ماچکردنی منداڵ، دەست بۆ بردنی، داکەندنی پانتۆڵەکەی با بە گاڵتەیشەوە بێت، ماچکردنی سمت و لێوەکانی، هەروەها هاندانی کوڕان بەوەی: "ئادەی هێنەکەت پیشانی مامە بدە!"؛ لە نموونەی ئەو ڕەفتارە چەوتانەن کە زیان لە گەشەی سێکسی منداڵ دەدات و دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێتییەکی ناتەندروست بەدەست بهێنێت. ئەو منداڵانەی بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، لەبری نەزاکەت و جوانخاسی، فێری هەڵسوکەوتی ناشیرین و دوور لە پرەنسیپەکانی ڕێزداری دەبن. ئەوجا لەبەر ئەوەی بە هەڵەشەیی و کۆنترۆڵکردنی بەرامبەر فێری دەربڕینی خۆشەویستی بوون، بۆیە دوور نییە لە ئایندەدا بەرامبەر هاوسەر و منداڵەکانی خۆیشیان بە هەمان شێوە ڕەفتار بکەن.

**منداڵ لە کاتی یاریکردندا، فێری ڕێزگرتن دەبێت.**

**ئایا هیچ گرفتێک لەوەدا هەیە، بەزۆر منداڵ بگریت و ماچی بکەیت؟**

بەڵێ، گرفت هەیە لە پەیوەندیی نێوان منداڵ و پێگەیشتوودا، بەتایبەت ئەو منداڵەی لە قۆناغی گەشەکردندا[1]یە.

خۆشویستن (کەسانی دەوروبەرت خۆش بوێت) و خۆشویستران (کەسانی دەوروبەرت تۆیان خۆش بوێت) جۆرێکە لە پێداویستی. لەگەڵ دروستبوونی ئەم پێداویستییە و بەدەمەوەهاتنی لەلایەن دایک و باوکەوە، منداڵ هەست بە باشی دەکات و بە شێوەیەکی تەندروستانە لە گەشەکردندا دەبێت. بەڵام ئەگەر هاتوو دایک و باوک بەبێ دروستبوونی ئەو پێداویستییە لە منداڵەکەیاندا و هەر لەبەر ئەوەی خۆیان حەزیان لێیەتی، منداڵەکەیان بەگیر هێنا و بەزۆر ماچیان

(١) گەشەکردن، واتە پڕبوونەوەی پێداویستییەکان.

کــرد و لەباوەشــیان گــرت، جــگە لە پڕکردنەوەی بۆشـاییەکانی خۆیـان، شـتێکی دیکەیان نەکردووە.

> ئەو منداڵانەی لە ڕووی عاتیفییەوە تێر بوون، حەز دەکەن لە دایک و باوکیان دوور بکەونەوە و چێژ لە سەربەخۆیی خۆیان وەربگرن.

بەدەوروخولدا هاتنی منداڵ بەبێ بوونی هیچ پێداویستییەک و خستنە بەردەستی ئەو شتانەی کە پێویستی پێیان نییە، دەبێتە هـۆی خووگیری لە منداڵـدا و بە زیـانیش بە سـەر گەشەی عاتیفیدا دەشکێتەوە.

هەنـدێکمان کە دەمانەوێـت خۆشەویسـتی بـۆ منـداڵەکانمان دەربـبڕین، دەکەویـنە هەڵەی گەورەگەورەوە. کاتێـک دەبینـین نایانەوێـت بـێن بـۆ لامـان، دەچـین ویسـت و ئیرادەیـان تێـک دەشـکێنین و دەیـانخەینە بەردەم کـۆمەڵە پێشنیارێک کە لە توانایانـدا نییە ڕەتـی بـکەنەوە. لە نمـوونەی: "ئەگەر مـاچێکم بدەیتێ، ئەو نوقڵەت دەدەمێ."، "ئەگەر بێیتە باوەشم، فڵانە یاریت بۆ دەکڕم."

دەبێـت منـداڵ ئـازادیی ئەوەی هەبێـت نەچێـت بـۆ لای گەورەکـان، ئەگەر ویستی لەسەر نەبوو. "نەخێر نـایەم!"، هێـزی ڕەتکـردنەوەیە، نابێـت زیـانی لـێ بدەین. ڕەتکردنەوەی گەورەکان، بەرهەمێکی گرنگی گەشـەی عـاتیفیی منداڵە. ڕەتکردنەوەی کەسێکی بەهێزتر و نەچوونە ژێر منەتیەوە، ڕەنگـدانەوەی مـتمانەی ئەو منداڵەیە بە خۆی. بۆیە دروست نییە گەورەکـان بە ئامـاژەی ڕووخسـار یـان فشاری عاتیفیی هاوشێوەی: "ئاخر ئەگەر نەیەیت، زویـر دەبـم!"، لە بڕیـارەکەی پاشگەزی بکەنەوە، چونکە ئەو مکوڕی و پێداگرییەی ئێستا دەینوێنێت، بنـاغەی دروستبوونی هێزی ئیرادەیەتی لە داهـاتوودا. ئیرادەشـی چەنـدە بەهێـز بێـت، لە ژیاندا ئەوەندە بەهێز دەبێت.

بیرمان نەچێت، لە زۆربەی ڕووداوەکانی دەستدرێژیکردنە سەر منداڵاندا، ئیرادە و پێداگریی منداڵەکە بەو شتە سەرنجڕاکێشانە تێک دەشکێندرێت کە دەخرێنە بەردەستی.

> دەبێت ڕێز لە ویستی منداڵ بگیرێت، کاتێک نایەوێت بچێت بۆ لای گەورەکان ماچی بکەن.

لە پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان باوان و منداڵدا، گرنگ پڕبوونەوەی پێداویستییەکانی منداڵەکەیە. کاتێک منداڵ هەست دەکات پێویستی بە خۆشەویستییە، دەچێتە لای گەورەکان و چاوەڕێی قسەی پڕ لە خۆشەویستییان لێ دەکات و دەیەوێت بەریەککەوتنی جەستەیی هەبێت لەگەڵیاندا، لەبەر ئەوە پێویستە دایکان و باوکان ئەو لایەنە فەرامۆش نەکەن. کە تێریش بوو، دەبێت ڕێز لەوە بگرین کە دەیەوێت سەربەستیی خۆی وەربگرێت.

> خاڵی بنەڕەتی لە پەروەردەی منداڵدا، بەدەمەوەچوونی پێداویستییەکانی منداڵە.

منداڵەکە ئەو پێویستییەی هەیەتی بۆ خۆشەویستی پڕ بووەتەوە، بەڵام دایک و باوکی هێشتا تێریان لێ نەخواردووە، بۆیە بەری نادەن و ناهێڵن بڕوات، ئەوە لە ڕووی پێدەگۆژییەوە ڕاست نییە.

### ئایا ئاساییە بەگاڵتەوە بە منداڵ بوترێت: "تۆ دەکەم بە بووکی خۆم"؟

لە هەر تەمەن و قۆناغێکدا بێت هەڵەیە بە منداڵ بوترێت: "دەتکەم بە بووکی خۆم."، "کچەکەی خۆمت دەدەمێ." ئەگەرچی بەگاڵتەیشەوە بێت.

منداڵ ئەو کاتە گەشە دەکات کە هەستەکانی سەربەست بن، دایک و باوک سەروزیادی پڕکردنەوەی پێداویستیی ڕۆڵەکانیانن بۆ خۆشەویستی. تاوەکو قۆناغی هەرزەکارییش پێویستیان بە هیچ پەیوەندییەکی نزیکی سۆزداریی دیکە نییە.

> **منداڵ لە دەرەوەی خێزانەکەی پێویستی بە وابەستەیی نزیکی عاتیفی نییە، دروستکردنی پەیوەندییەکی لەو جۆرە، تەگەرە دەخاتە بەردەم گەشەکردنی.**

لەو ڕووەوە، منداڵ نە دڵخۆش دەبێت بەوەی پێی بڵێیت: "دەتهێنم بۆ کوڕەکەم."، "کچەکەی خۆمت دەدەمێ."، نە ئازادییەکی تازەش زیاد دەکات بۆ ئازادیی ڕۆحی.

منداڵ بەو جۆرە قسانە بێتاقەت دەبێت، دەکەوێتە بیرکردنەوە تاکو مانایەک بەو قسانە ببەخشێت و بزانێت تا چ ڕادەیەک دەبنە ڕاستی. سەرقاڵبوونیشی بەو شتانەوە، بیر و توانای سەرنجی پەرتوبڵاو دەکات. نەک هەر ئەوەندە، بگرە لە گەورەییشدا هەست بە شوێنەواری قسەکان دەکات و چەندین (تۆ بڵێی ئەگەر و ئاخۆ) مێشکی ماندوو دەکەن.

> **منداڵی خوار تەمەن ٧ ساڵ لە ترسی دوورکەوتنەوە لە دایک و باوکی، بەو جۆرە قسانە زۆر بێتاقەت دەبێت.**

چەندین کەسی وا هەیە، تەنانەت پاش هاوسەرگیرییش ئەو قسانەیان بیر ناچێتەوە کە لە منداڵیدا بەگاڵتەوە پێیان وتراوە. لەگەڵ هەر گرفتێکی خێزانیدا، (وا هەست دەکەن دەرفەتێکی باشتریان) لەدەست خۆیان داوە. بۆیە توانای بەرگرییان بەرامبەر گرفتەکان دادەبەزێت و زیاد لە هەوڵی چارەسەر ،خەفەت بۆ ئەگەرێکی وەهمی دەخۆن.

بەدەر لەوە، ئەگەر ئەو قسانە بە منداڵی خوار تەمەن ٧ ساڵ بوترێت، هەست بە دڵەڕاوکە و نیگەرانی دەکات، چونکە وا بیر دەکاتەوە لە دایک و باوکی جیا دەبێتەوە، لەبەر ئەوە بە جۆرێک بەرگری لە خۆی دەکات و کاردانەوە دەنوێنێت، وەک ئەوەی بەزۆر ناچاری ئەو کردارە کرابێت.

گەورەکان بۆ خۆشی ئەو قسانە دەکەن، بەڵام بێئاگان لەوەی وتەکانیان چ شوێنەوارێکی نەسڕاوە لە دونیای هەست و بیرکردنەوەکانی منداڵدا دروست دەکەن.



**هەندێ لەو قسانەی گەورەکان بۆ خۆشی دەیکەن، چەندین شڵەژانی دەروونیی درێژخایەن لە هەستەکانی منداڵدا دروست دەکەن.**



باشە چی بکەین، ئەگەر منداڵ ڕووبەڕووی قسەیەکی لەو جۆرە بوویەوە؟ ئاسانە، بێ ئەوەی خۆمان بشڵەژێنین لە دەرفەتێکدا بۆی ڕوون دەکەینەوە کە ئەو ڕەفتارەی مامە یان پووری، ڕەفتارێکی دروست نەبووە. ڕاستە بەگاڵتەوە وایان وتووە، بەڵام گاڵتەکەیان لە جێی خۆیدا نەبووە. جا ئیتر کە منداڵ هەست بە پشتیوانیی دایک و باوکی دەکات، ئەوەندە ناچێتە ژێر کاریگەریی قسەکانەوە و بەرگری پەیدا دەکات.

**ئایا دروستە وشەگەلێکی هاوشێوەی: (خوێڕی، هەتیو، پاتاڵ، سەرسەری...) بۆ دەربڕینی خۆشەویستی لەگەڵ منداڵدا بەکار بهێنین؟**

**نەخێر، بە هیچ شێوەیەک.**

بانگکردنی منداڵان بەو دەستەواژە ناشیرین و بازاڕییانەی ئاماژەی نەرێنیی لا دروست دەکەن، ڕەفتارێکی هەڵەیە.

> زیادەڕەوی با بەگاڵتەیشەوە بێت، زیان لە گەشەی کەسێتی دەدات.

ئەو وێنە و یەکترڕاکێشـانە زیهنیـانەی کە بە هـۆی ئەو دەستەواژانەوە لە بیری منداڵـدا بەرجەسـتە دەبـن، شوێنکاری سلبییان لە سـەر گەشـەی کەسـێتییەکەی دەبێت.

ئاشـکرایە بەو قسـانە کەسـێکی لەو جـۆرەی لێدەرناچێت، بەڵام هیچ دوور نییە سەر بکێشن بـۆ ئەو لادانە سلوکییانەی کە ماوەیەکی دوورودرێژیان دەوێـت تـاکو چارەسـەر دەبن. ئەو منداڵەی بە "خـوێری" و "سەرسـەری" بانـگ دەکرێـت، ڕەنـگە لە قوتابخانە کچان بێزار بکات. ئەوەیشـی پێـی دەوترێـت "پاتـاڵ"، لەوانەیە وا گومان بەرێت کە حەزی لە پاکوخاوێنی نییە.

ئەو ڕەفتار و خووە ناپەسەندانەی لەو ناو و ناتۆرانەوە سـەرچاوە دەگـرن، دایکـان و باوکـان ناچـار دەکەن هەوڵ و تەقەلایەکـی زۆر بـدەن تـاکو منداڵەکانیان لە چنگیان ڕزگار بکەن.

ئەگەرچی ئەو شێوازە لە دەربڕینی خۆشەویستی کەیفبەخشـە بـۆ گەورەکـان، بەڵام منداڵ ئامرازی کەیف و دڵخۆشیی ئەوان نییە.

بەدەر لەوە، هـیچ گرفتێـک لەوەدا نـیـە جاروبـار دایکـان و باوکـان لە خۆشەویستیدا بە منداڵەکانیان بڵێن: "شۆخوشـەنگەکەم، شـازادەکەی دایە و بابە و... هتد".

گرفتەکە لەوەدایە، ئەو وشانە بـبن بە سـیفەتی منـداڵەکە و دەوروبەرەکەی بەو وەسفانە بانگی بکەن.

بانگکردنی منـداڵ بە نـاوی خـۆیەوە، بە یەکێـک لە خـاڵە بنەڕەتییەکـانی پێدەگۆڕی دادەنرێت.

> **بانگکردنی منداڵ بە ناوی خۆیەوە، کاریگەریی گەورەی هەیە لە سەر گەشەی کەسێتییەکەی.**

بەدەر لەوە، یەکێــک لەو ڕەفتــارە هەڵانەی جارباره تێی دەکەوین ئەوەیە، کاتێك دەمانەوێت بە کوڕێـک یـان کچێکـدا هەڵبـدەین، دەڵێـین: "دەڵێی کچە، ئەوەندە جوانە"، یان "ماشـائەڵڵا هەر دەڵێی کوڕە"، ئەم جۆرە هەڵەیە لە ئاخـاوتن، پـاڵ بە منـداڵەکەوە دەنێـت لەبـری ئەوەی بەگـوێرەی سروشت و مەزاجی خۆی بەردەوامی بە گەشـەی بدات، تواناکانی بە ئاڕاستەی ئەو قسانە پەرە پێ بدات.

ئەو کــچەی ڕووبەڕووی وتەیەکــی هاوشــێوەی"کچێکە وەک کــوڕ" دەبێـتەوە، کەسـێتییەکەی لە سـەر بنەمـای "وەک کـوڕ بەهێـز بێت" بنیـات دەنێت، نەوەک لە سەر بناغەی پاڵنەرە سروشتییەکانی ناخی.

هەرچی ئەم قسەیەشە: "هێندە جوانە، دەڵێـی کیژە"، وا لە کـوڕان دەکـات لە ڕەفتار و جووڵەی کـوڕانە دوور بـکەونەوە و زیـاتر حەز لە لەنـجەولار و زمـانی جەستەی کچان بکەن.

> **ئاخاوتن و پیاهەڵدانی هەڵە، کار لە ڕەوتی گەشەی کەسێتیی منداڵ دەکات.**

کاریگەرییەکی خراپی تری ئەم قسـانە، ڕووی لە داهاتووە. خوانەخواستە لە حـاڵەتی دەسـتدرێژی و گێچەڵی سێکسیدا، عەقڵـی نائاگـا پاسـاوی ئەوەی "ئـاخر مـن لە کـچ دەچـم"، وەک بیـانوویەک بـۆ ڕووداوەکە دەهێنێتەوە.

**ئایا بەکارهێنانی هێز لە کاتی یاریی وەك کاراتی و زۆراندا، زیانی هەیە بۆ منداڵ؟**

**بەڵێ، هەیەتی.**

بەشێک لە دایکان و باوکان بە مەبەستی بەهێزی و پتەویی جەستەیی ڕۆڵەکانیان -بەتایبەت کوڕان- کۆمەڵە یارییەکی وەک کاراتی و زۆرانگرتن لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەکەن. خۆی لە ڕاستیدا کێشەیەک نییە لەوەدا کە منداڵ لەگەڵ کەسی لە خۆی گەورەتر زۆران بگرێت، تەنانەت سوودیشی هەیە لەو ڕووەوە کە لێکەوتنی لەگەڵ دایک و باوک تێدایە.

> **منداڵ بە شەق و شەپازڵە بەهێز نابێت.**

بەڵام لێرەدا خاڵێک هەیە پێویستە ئاگاداری بین، ئەویش ئەوەیە کاتێك گەورەکان توانای تەواوەتیی خۆیان بەکار دەهێنن و پتەویی دەست و بازوویان وەک فاکتەری هێز و باڵادەستی نمایش دەکەن و بواریان نادەن و بەردەوام لێیان دەبەنەوە، هێزی ئیرادە و بەرگریی منداڵ لاواز دەبێت و وا گومان دەبات کە: "هەرگیز ناتوانێت لە ڕووی کەسی گەورەدا بوەستێتەوە." قەناعەتێکی پێشوەختەی لەو جۆرە، ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی نەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات ئەگەر هاتوو لە داهاتوودا ڕووبەڕووی دەستدرێژیی سێکسی بووەوە.

> **دەبێت جاروبار دایکان و باوکان دەرفەتی بەکارهێنانی هێز بۆ منداڵەکانیان بڕەخسێنن و ڕێگە بدەن منداڵەکانیان بەسەریاندا زاڵ ببن.**

دەست و پێ بەستکردنی منداڵ و لەجووڵەخستنی تا بڵێی هەڵەیە.

زۆرێک لەو منداڵانەی تووشی دەستدرێژیی سێکسی بوونەتەوە، کاتێک لێیان دەپرسین: "بۆچی بەرگریتان لە خۆتان نەکرد؟"، لە وەڵامدا دەڵێن: "ئاخر دەترسام

لێم بدات، چونکە ئەو لە من بەهێزتر بوو." هەر هەڵسوکەوت و ڕەفتارێک ئەو پەیامە بدات بە عەقڵی نائاگای منداڵ کە دەسەڵاتی بەسەر گەورەکاندا ناشکێت و توانای لە ڕوودا وەستانیانی نییە، ئیرادەی منداڵ پەک دەخات و دەستەمۆی دەکات.

پێویستە جاروبار دایکان و باوکان دەرفەتی بەکارهێنانی هێز بۆ منداڵەکانیان بڕەخسێنن و ڕێگە بدەن منداڵەکانیان بەسەریاندا زاڵ ببن، بەڵام نابێت ئەمە بە چەشنێک بێت منداڵەکە وا بیر بکاتەوە کە: "ئەوە بەئەنقەست خۆی دەدۆڕێنێت، ئەگەر نا ئەو لە من بەهێزترە"، لەبەر ئەوە پێویستە بەهەستیاری مامەڵە بکەین.



**لەوە هەڵەتر نییە دەست و قاچی منداڵ ببەستیت و نەهێڵیت جووڵە بکات، ئەمە چییە، خۆشت دەوێت!.**



دەربڕینی خۆشەویستی بە شەق و زللە نابێت، بەوە بەهێز نابێت تووڕەی بکەیت. ئەو منداڵانەی بەو شێوەیە گەورە دەبن، ئازایەتیی خۆیان لە هەڵسوکەوتی ناشیرین و زبردا دەبیننەوە نەوەک لە هاوسەنگی و جوان مامەڵەییدا.

**ئایا هیچ پەیوەندییەك لە نێوان زۆرکردن لە منداڵ و گەشەی سێکسیدا هەیە ؟**

**بەڵێ، هەیە.**

یەکێک لە بۆچوونە چەوتەکان ئەوەیە، پێت وا بێت بە زۆرلێکردن و زەبوونکردنی منداڵ، ئەو ئاکارەی دەتەوێت، دەتوانیت تێیدا بچەسپێنیت. بێئاگا لەوەی ئەو جۆرە مامەڵانە، بەرگریی منداڵەکانیان لاواز دەکات

بەرامبەر هەر دەستدرێژییەک کە دەکرێتە سەریان، چونکە لە هێز دەترسن و بێ ئەوەی خۆیان ڕاپسکێنن یان بەرگری بکەن، خۆیان دەدەن بەدەستەوە.

کۆمەڵێک هەڵسوکەوتی هەڵە هەیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، دەبێتە هۆی دابەزینی توانای بەرگریی ڕۆڵەکانمان بەرامبەر بەزاندنی سنوورە کەسییەکانیان و دەستدرێژیکردنە سەریان، لە نموونەی ئەوانە: منداڵەکە نان ناخوات، کەچی دەبینیت دایکی دێت دەست و قاچی دەبەستێتەوە و بەزۆر دەرخواردی دەدات. یان بۆ ئەوەی نانەکەی بخوات، چەقۆ و دەرزی و ئامرازی ترسێنەر لای خۆی دادەنێت. یان چاوترسێنی دەکات و پێی دەڵێت: "ئەگەر نەیخۆی، پۆلیس دێ... دکتۆرەکە دێ"... یاخود منداڵێک جلەکانی داناکەنێت، دایکی دێت بەزۆر و زۆرداری لەبەری دادەکەنێت و یەک دوو زللەییشی لێ دەدات. ئەو منداڵەشی کەللەڕەقی دەکات و ناچێت بۆ تەوالێت، دایکی بە زۆر بیجامەکەی دادەکەنێت، ئەوجا بە خۆشی بێت یان ترشی دایدەنیشێنێت. کە ویستیشی هەڵیبستێنێت، فشار دەخاتە سەر پێیەکانی.

زۆرلێکردنی منداڵ بۆ ئەوەی ڕەفتارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات، هۆکاری لاوازبوونی ئیرادە و سستبوونی گەشەی کەسێتییەتی.

تەنانەت ئەگەر منداڵ لە حاڵەتی نەخۆشی و پێویستیشدا بە قسەی دایک و باوکی نەکرد، ئەوە نابێتە پاساو بۆ بەکارهێنانی هێز و زەبر لەگەڵیدا. بەزۆر ڕاپێچکردنی منداڵ تاکو دانی بکێشێت، گرتنی دەست و قاچی ئەو منداڵەی لە خەتەنەکردن و خوێندان دەترسێت... کۆمەڵە هەڵسوکەوتێکی هەڵەن با لە سوود و بەرژەوەندیی ئەویش بێت، چونکە هێز و زەبری جەستەی گەورە لەئارادایە. باشترین شت لەو دۆخانەدا ئەوەیە، لە ترس و دڵەڕاوکەکانی تێبگەین، لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە پێی بڵێین کە چەندە ئازار دەچێژێت. خۆ

ئەگەر ترسەکانی هەر نەدەڕەوییەوە، ئەوکات پەنا دەبەینە بەر ڕێگەچارەی تری پزیشکی، چونکە ئەمە لەوە باشترە بە هێزی جەستەی گەورە چارەسەر بکرێت.

هیچ حاڵەتێک نابێتە پاساو بۆ بەکارهێنانی زەبر و هێز لەگەڵ منداڵدا.

مەسەلەکە تەنها فشاری جەستەیی نییە، هاوارکردن، چاوسوورکردنەوە و ڕووگرژکردنیش، بە هەمان شێوە توانای بەرگریی منداڵ کەم دەکاتەوە و کاریگەریی نەرێنیی لە سەر دروست دەکات.

ئەگەر دەتەوێت منداڵەکەت کردارێک ئەنجام بدات، ئەوا پەنا مەبەرە بەر فشار و زەبروزەنگ. ڕێگەی ئاسانتر و کاریگەرتر هەیە؛ بزانە لەبەر چ هۆکارێک ئەو کردارە ئەنجام نادات، پاشان هۆکارەکە مەهێڵە.

ئەگەر دەتەوێت منداڵەکەت کردارێک ئەنجام بدات، ئەوا پەنا مەبەرە بەر فشار و زەبروزەنگ. سەرەتا بزانە لەبەر چ هۆکارێک ئەو کردارە ئەنجام نادات، پاشان هۆکارەکە مەهێڵە.

## ئایا هیچ کێشەیەك لەوەدا هەیە کە منداڵان لە نێوان خۆیاندا یاریی دکتۆردکتۆرێنە و ماڵەباجێنە بکەن؟

دەتوانین بڵێین، لە بنەڕەتدا هیچ کێشەیەک لەوەدا نییە منداڵان لە نێوان خۆیاندا ئەو جۆرە یارییانە بکەن.

ئەو جۆرە یارییانە کاتێک دەبنە کێشە، کە جەستەی یەکتری وەک ئامرازی یاریکردن بەکار بهێنن. لە یاریی دکتۆردکتۆرێنەدا، منداڵان یەکێک لە خۆیان بچووکتر پاڵ دەخەن و جلەکانی بەری دادەکەنن و لە سەر جەستەی یاری دەکەن، کە ئەوە خۆی لە خۆیدا کارێکی دروست نییە.

> «نابێت منداڵ یاری بە لەشولاری منداڵێکی تر بکات.»

یان جاری وایە لە یاریی ماڵەباجێنەدا دەبنە ژن و مێردی یەکتری و ماچماچێن دەکەن و لای یەکەوە دەخەون، بڕوا ناکەم ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە لەگەڵ کرۆکی یاریکردندا یەک بگرنەوە.

ئەی چی بکەین لەو منداڵانەی کە خەریکی ئەو یارییانەن؟ لەبری ئەوەی لێیان تووڕە بین یاخود زویریان بکەین، بۆ ماوەیەک دەچینە ناو یارییەکەیانەوە، پاشان هێدی هێدی پێکەوە ڕێساکانی یارییەکە سەرلەنوێ دادەڕێژینەوە.

بیرمان نەچێت، چ دکتۆردکتۆرێنە بێت یان هەر پیشەیەکی تر کە لە بەرگی یاریدا نمایش دەکرێت، یارمەتیی گەشەی منداڵ دەدات. بەتایبەت یاریکردن بە بووکەڵە زۆر گرنگە، تەنانەت کوڕانیش دەتوانن یاری بە بووکەڵە بکەن، گرنگ ئەوەیە لە کاتی یاریدا جەستەی یەکتر بەکار نەهێنن.

## ئایا ئاساییە منداڵان لە کاتی یاریکردندا دەرگای ئەو ژوورە دابخەن کە یاریی تێدا دەکەن؟

نابێت بە چاوی گومان و بەدبینییەوە تەماشای هیچ کام لە یارییە منداڵانەکان بکەین.

یاریکردن یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی گەشەی منداڵ. یاریکردن بەکۆمەڵ، چوار هێندەی ئەو یارییانە سوودی هەیە کە منداڵ بەتەنیا خۆیەتی.

**پێویستە دەرگای ئەو ژوورە کراوە بێت، کە منداڵ تێیدا یاری دەکات.**

لە یاریکردندا فێری ئەوە دەبێت چۆن لەگەڵ هاوڕێکەیدا پەیوەندی دروست بکات، فێری ئەوە دەبێت لە هەستەکانی هاوڕێکەی تێبگات، فێری بەڕێوەبردن و بەڕێوەبران دەبێت، فێری پێویستیی

پەیڕەوکردنی ئەو ڕێسایانە دەبێت کە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دایاننەوە.

مەرجی سەرەکیی بەدەستهێنانی ئەو سوود و قازانجانەش، پێش هەموو شتێک ژینگەیەکی ئارام و سەربەستە.

> بۆ ئەوەی منداڵ سوود لە یاریکردن وەربگرێت، پێویستی بە کەشێکی ئارام و سەربەستە.

منداڵان کە دەیانەوێت دەست بکەن بە یاری، بەدوای کەشی ئارام و ئازاددا دەگەڕێن و دەچنە ژوورێکی ترەوە.

ڕەنگە لەم بارەدا دەرگا داخستن یارمەتیی سەرنج و دوورکەوتنەوەیان بدات لەو هۆکارانەی کە سەرنجیان بۆ لای شتی تر ڕادەکێشێت.

جاری وایش هەیە دەرگاداخستنیان لەبەر ئەوە نییە کە دەیانەوێت بچنە ناو یارییەکەیانەوە، بەڵکو دەیانەوێت گەورەکان چاوبەست بکەن و زەمینە بڕەخسێنن بۆ ئەنجامدانی ئەو یارییانەی بە پەسەند دانانرێن. پێویستە لە سەر دایکان و باوکان، هاوکاری منداڵەکانیان بن لە ڕەخساندنی ژینگەی یاریکردندا، بەڵام دەبێت لە هەمان کاتدا ئەوەشیان بۆ ڕوون بکەنەوە کە دەرگا داخستن کارێکی دروست نییە.

> پێویستە دایکان و باوکان هاوکاری منداڵەکانیان بن لە ڕەخساندنی ژینگەی یاریکردندا، بەڵام هاوکات دەبێت ئەوەشیان بۆ ڕوون بکەنەوە کە دەرگا داخستن کارێکی دروست نییە.

تەنانەت ئەگەر پێویست بکات وەک ڕێزێک بۆ منداڵەکانیان، گەورەکان دەتوانن زیاتر بێدەنگ بن و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ و ئەو ئامێرانەش کز بکەن کە سەرچاوەی دەنگەدەنگن و ناهێڵن منداڵەکان ڕۆبچنە ناو یارییەکانیانەوە.

لایەنێکی تر ئەوەیە کە منداڵانی هاوتەمەن یان هاوڕەگەز پێکەوە یاری دەکەن، ئەوانەی لەوان بچووکترن یان لە ڕەگەزی ئەوان نین، لە دەرەوەی یارییەکە دەمێننەوە. دەبێت بزانرێت کە جاری وا هەیە منداڵان بۆیە دەرگا دادەخەن، چونکە نایانەوێت منداڵانی تر لێیان تێک بدەن، لەو جۆرە حاڵەتانەدا دەبێت ڕێز لە ویستی ئەو منداڵانە بگیرێت کە چوونەتە ژوورێکی تایبەت. ئەی ئەو منداڵانەی بەشداری یاری نین، چی بکەن؟ گەورەکان لەگەڵیاندا یاری دەکەن.

## ئایا دیمەنی عەشق و خۆشەویستیی ناو فیلم و زنجیرە دراماکان، کاریگەریی خراپیان هەیە لە سەر گەشەی منداڵەکانمان؟

ئەو فیلمانەی دیمەنی ئەوین و سۆزدارییان تێدایە، کاریگەریی باشیان هەیە لە سەر گەشەی منداڵ، بە مەرجێک منداڵەکە پێی نەنابێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە، چونکە دەرفەتێکی لەبارە بۆ بەئاگاهێنانی ئەو هەستانە و خۆبەرەپێشبردنی لەو ڕووانەوە.

**نابێت دایکان و باوکان فیلمێک بخەنە بەردەست منداڵەکانیان، کە پێشتر خۆیان سەیریان نەکردووە.**

بەڵام لە هەرزەکاریدا بە هۆی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی خێرای هەستەکانی هەرزەکار، هەر زوو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دیمەنەکان و دەربڕینی هاوسۆزی بۆ ئەکتەرەکان و ڕێخۆشکردن بۆ ئەزموونکردنی هەمان ئەو هەستانە لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا. ئاخر هێشتا تەمەنی (١٤-١٥) ساڵە، کەچی دەیبینی عاشق بووە، یان پەیوەندیی سۆزداریی هەیە. دەی ئیتر چۆن

کەموکورتی ناکەوێتە گەشەیەوە! لەبەر ئەوە حاڵەتێکی تەندروست نییە هەرزەکار تەماشای ئەو فیلم و گرتانە بکات، کە پەیوەندیی سۆزداریی خەستوخۆڵ نمایش دەکەن.

بەگشتی فیلمی (کۆمیدی، سەرکەشی، ئاکشن، پۆلیسی)، بابەتی منداڵانی هەرزەکارن.

لەگەڵ ئەوەشدا، کۆمەڵێک فیلم و دراما هەن کە بابەتەکانیان ڕاستەوخۆ سێکسی نین، بەڵام ئەو دیمەنی عەشق و ئەوینەی نمایشی دەکەن، بیروهۆش دەبەن بە لای سێکسدا، بۆیە لە هیچ تەمەنێکدا دروست نییە منداڵ تەماشایان بکات.

دایک و باوک دەبێت زانیارییان هەبێت سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەو فیلمانەی پێکەوە لەگەڵ منداڵەکانیان سەیری دەکەن. کاتێکیش لەپڕ دیمەنێکی نەشیاویان بینی، دەتوانن بێ ئەوەی خۆیان سەغڵەت بکەن، فیلمەکە پێش بخەن.

بەرامبەر هیچ دیمەنێکی عەشق و خۆشەویستی -ئەگەرچی هەستی سێکسییشی تێدا بێت- نابێت ئاماژەی بێزکردنەوە بنوێنین، چ بە زمانی جەستە بێت یان گوفتار.

چونکە هەر ئەوەندەی سێکس بەسترایەوە بە کۆمەڵە چەمکێکی وەک بێزراوی و پیسییەوە، ئیدی عەقڵی نائاگا هەڵوێستێکی نەیارانە دەگرێتە بەر بەرامبەر (سروشتیترین لایەن)ی ژیانی مرۆڤ.

جگە لە قۆناغی هەرزەکاری، بە شێوەیەکی گشتی منداڵ هەست بە دڵەڕاوکە دەکات بەرامبەر ئەو ئاماژە و جووڵانەی کە هەستی سێکسییان لەخۆ گرتووە. بەلایەوە سەیرە، بۆیە تووشی دڵەڕاوکە دەبێت، تەنانەت ئەگەر سەیری فیلمێکیش بکات کە دیمەن و جووڵەی وای تێدایە کە ئاماژە بۆ سێکس دەکەن،

لەبەر ئەوە نییە کە حەزی لێیەتی یان پاڵنەری سێکسیی هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە پەرۆشە بزانێت دواتر چی ڕوو دەدات. پێویست ناکات دایک و باوک بە پرسیار و ڕوانینە پڕ پەرۆشییەکانی منداڵەکانیان خەمیان لێبێت، چونکە ئەو جۆرە پەرۆشییە پەیوەندیی بە سەر هەستی سێکسییەوە نییە.

لە تەمەنی هەرزەکاری و قۆناغەکانی دواتردا، پەرۆشیی منداڵ بۆ ئەو فیلمانەی ناوەرۆکی سێکسییان هەیە، ڕەنگە بە هۆی پاڵنەر و وروژێنەری سێکسییەوە بێت، بەڵام بوونی دایک و باوک و خوشک و براکانی ڕێگرن لە دروستبوونی ئەو جۆرە هەستە. ئەو دیمەنەی لەو کاتەدا چاوی پێ دەکەوێت، هیچ دوور نییە دواتر بەتەنیا سەیری بکات، یان لە ئینتەرنێتدا بەدوایدا بگەڕێت. بۆیە کاتێک لەم ڕووەوە دەڕوانینە بابەتەکە، بۆمان دەردەکەوێت بەرچاوکەوتنی دیمەن و گرتەی سێکسی لە کاتی سەیرکردنی ئەو فیلمانەی بێخەبەرین لە ناوەرۆکەکانیان، ناحەقییەکی گەورەیە بەرامبەر منداڵەکانمان.



**کاتێک سێکس دەبەسترێتەوە بە کۆمەڵە چەمکێکی وەک بێزراوی و پیسییەوە، ئیدی عەقڵی نائاگا هەڵوێستێکی نەیارانە دەگرێتە بەر بەرامبەر (سروشتیترین لایەنی) ژیانی مرۆڤ.**



**ئایا ئەو کەرەستە بینراوانەی دیمەنی سێکسییان تێدایە، زیان بە گەشەی سێکسی منداڵ دەگەیەنن؟**

**بەڵێ.**

ڕۆحی منداڵ کاتێک گەشە دەکات، کە شانبەشانی گەشەی (عاتیفی) و (زیهنی) بێت.

چ ئەو منداڵانەی لە ڕووی عاتیفییەوە گەشەیان کردووە، بەڵام لە ڕووی گەشەی زیهنییەوە لە دواوەن، چ ئەوانەش کە لە ڕووی زیهنییەوە لە پێشەوەن، بەڵام کەموکورتییان هەیە لە گەشەی عاتیفیدا، لە منداڵانی تر زیاتر ئەگەری گرفتاربوونیان هەیە بە کێشە.

بۆ نموونە؛ ئەو منداڵەی لە ڕووی زیهنییەوە پێگەیشتووە و لە ئاستێکدایە بچێتە قوتابخانە، ئەگەر لە ڕووی عاتیفییشەوە لە هەمان ئاستدا نەبێت، ئەوکات گرفتی جۆراوجۆر دێتە ئاراوە. لە لایەکەوە بەئاسانی فێری خوێندنەوە و نووسین دەبێت، بەڵام لە بەرامبەردا پێداگری دەکات لە سەر ئەوەی نەچێتەوە بۆ قوتابخانە و لە دایکی دوور نەکەوێتەوە.



**دیمەنە سێکسییەکان، زیان لە گەشەی عاتیفی و زیهنیی منداڵ دەدەن.**



وەک دەزانین گەشەی سێکسی، هەستیارترین لایەنی گەشەی منداڵە. جیاوازییەکی بچووکی نێوان گەشەی عاتیفی و زیهنی، وا لە منداڵ دەکات ڕەفتاری نائاسایی بنوێنێت.

ئەو منداڵانەی لێرە و لەوێوە چەند (زانیارییەکیان) سەبارەت بە بابەتە سێکسییەکان دەست کەوتووە، بەڵام هێشتا (هەستەکانیان) ئەوەندە پێنەگەیشتووە هاوشانی گەشەی سێکسییان بێت، دەبینی بەئاسانی هەڵدەخەڵەتێنرێن و دەبنە قوربانی دەستدرێژیی سێکسی. نازانێت کە چییان بەسەردا هێناوە، وا دەزانێت سێکس گاڵتەوگەپە. تەواو پێچەوانەی ئەمە، ئەو منداڵەی سەرباری بەئاگاهاتنەوەی هەستە سێکسییەکانی، لە ڕووی زیهنییەوە وەک پێویست گەشەی نەکردووە، دەبینی بەزەحمەت کۆنترۆڵی هەستەکانی پێ دەکرێت. عەقڵی ئەو جۆرە منداڵانە، لە بەرامبەر هەژموونی هەستەکانیاندا شکست دەهێنێت و ناتوانێت لێکدانەوەی مەنتقی بکات. هەر بۆیە نابێت پێش تەمەنی ئاسایی خۆیان

ئاشنای هەستە سێکسییەکان ببن، یاخود دەستیان بگات بەو زانیارییە سێکسییانەی کە هی ئەو تەمەنە نییە.

**ئەو منداڵانەی لێرە و لەوێوە چەند (زانیارییەکیان) سەبارەت بە بابەتە سێکسییەکان دەست کەوتووە، بەڵام هێشتا (هەستەکانیان) ئەوەندە پێنەگەیشتووە هاوشانی گەشەی سێکسیان بێت، بەئاسانی دەبنە قوربانیی دەستدرێژیی سێکسی.**

ئەو منداڵانەی بە هۆی ئەو فیلم و درامایانەی سەیریان دەکەن یان ئەو کتێب و ڕۆمانانەی دەیانخوێننەوە، پێش تەمەنی خۆیان ئەزموونی هەستە سێکسییەکانیان کردووە و پێیان ئاشنا بوون، بە هۆی تەمەنیشیانەوە لە ئاستێکدا نین لێی تێبگەن، هیچ دوور نییە ببنە دیلی هەستە سێکسییەکانیان.

لەبەر ئەوە منداڵ لە هەر تەمەن و قۆناغێکدا بێت، دروست نییە چاوی بکەوێت بەو دیمەن و ئاخاوتن و نووسراو و بابەتانەی کە ناوەڕۆکی سێکسییان هەیە. منداڵ لە دوای قۆناغی هەرزەکارییەوە توانای خۆکۆنترۆڵکردن و ئاڕاستەکردنی هەستەکانی بەدەست دەهێنێت، بۆیە نابێت چاوەڕێی ئەوە لەو منداڵانە بکەین کە هێشتا لە قۆناغی هەرزەکاریدان.

**منداڵ لە دایک و باوک و خێزانەکەیەوە فێری ئەوە دەبێت کە بەکارهێنانی جەستەی مرۆڤ وەک ئامرازێک بۆ تێربوونی سێکسی، بێڕێزی و سووکایەتییە بە مرۆڤ.**

لە لایەکی دیکەوە، منداڵ لە ناو خێزاندا فێری ئەوە دەبێت کە بەکارهێنانی جەستەی مرۆڤ وەک ئامرازێک بۆ تێربوونی سێکسی، بێڕێزی و سووکایەتییە بە مرۆڤ.

ڕۆژنامە و گۆڤار و پێگە ئەلەکترۆنییەکان؛ هۆکاری وورووژاندنی هەستی سێکسییەکانی منداڵن، بۆیە دەبێت بەهەستیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

## ئایا ڕۆمانە ڕۆمانسییەکان کاریگەریی خراپیان هەیە لە سەر گەشەی سێکسیی منداڵ؟

بەدڵنیاییەوە.

ڕۆمانە ڕۆمانسییەکانیش -هاوشێوەی فیلم و دراماکان- دەکرێن بە دوو بەشەوە: ئەو ڕۆمانانەی عەشق و ئەوینیان تێدایە، لەگەڵ ئەو ڕۆمانانەی کە بابەتی سێکسییان تێدایە.

ئەو ڕۆمانانەی دیمەنی سێکسی بە مێشکی مرۆڤدا دەهێنن و وردەکاریی پەیوەندیی نێوان هەردوو ڕەگەز وێنا دەکەن، کاریگەریی خراپیان بۆ سەر گشت قۆناغ و تەمەنەکان هەیە.

بگرە ئەو ڕۆمانانەی بڕگەی سێکسییان تێدایە، لە فیلمە سێکسییەکان کاریگەرییان زیاترە، چونکە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆماندا، منداڵ خۆی دونیای ئەندێشە و خەیاڵ دروست دەکات. خۆی هەڵدەستێت بە دوورینی وێنا بە بەری ئەو کەسایەتی و ڕووداوانەدا کە خەیاڵیان دەکات، ئەو وێناکردنانەش لە سەر جوانترین و تەواوترین شێوەن. فیلم خەیاڵ سنووردار دەکات، بەڵام ڕۆمان بەپێچەوانەوە، خەیاڵ فراوان دەکات.

لەبەر ئەوە وا باشە دایکان و باوکان پێشنیاری ئەو کتێبانە نەکەن بۆ ڕۆڵەکانیان کە ئاگاداری ناوەڕۆک و بابەتەکانیان نین، پێویستە لانی کەم بزانن باسی چی دەکات.

> **نابێت دایک و باوک کتێبێک بدەن بە دەست منداڵەکەیانەوە، کە خۆیان نازانن باسی چی دەکات.**

## ئایا ئاساییە لە قۆناغی هەرزەکاریدا منداڵ دەستپەڕ بکات؟

نەخێر، ئاسایی نییە.

کرداری دەستپەڕکردن کە لە قۆناغی هەرزەکاریدا بە شێوەیەکی بەرچاو ئەنجام دەدرێت، هەرگیز کردارێکی ئاسایی نییە. هەر ڕەفتارێک ئارەزووی سێکسیی پێ تێر بکرێت، خواستی سێکس زیاتر دەکات و ئیرادەش لاوازتر دەکات.

ڕاستە لەو قۆناغەدا وروژانی زیاد لە پێویست و چڕبوونەوەی هۆرمۆنەکان و هەستکردن بە چێژی سێکسی پاڵ بە هەرزەکارەوە دەنێن بۆ ئەوەی لە ئەندامی زاوزێیدا بەدوای چێژدا بگەڕێت، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، بنەما ئەخلاقییەکانی ناخی منداڵ یارمەتیی دەدات تاکو ئارەزووە سێکسییەکانی بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە.

دەبێت ئەوە بزانین کە کرداری دەستپەڕکردن لە قۆناغی هەرزەکاریدا، شوێنکاری نەرێنی لە سەر گەشەی کەسێتیی هەرزەکار جێ دەهێڵێت. ئەو هەستکردن بە تاوانبارییەی کە هەرزەکار لە پاش ئەو پڕۆسەیە لە ناخیدا هەستی پێ دەکات، دەبێتە مایەی سستکردنی گەشەی کەسێتییەکەی، ئەمە جگە لەوەی دەبێتە هۆکاری ڕەفتاری شەڕانگێزی و نائارامیی دەروونی.

**لە هیچ قۆناغێک لە قۆناغەکاندا دروست نییە منداڵ دەستپەڕ بکات، ئەو کردارە گەشەی کەسێتی سست دەکات و دەبێت بە خوو.**

ڕەنگە ڕێگەچارەی دروست لەگەڵ ئەو هەرزەکارانەدا کە گیرۆدەی ئەو خووەن، ئەوە بێت دووبەدوو قسەی زانستییان لەگەڵدا بکەین. ئەگەر پێویستیش بکات، دەبێت سڵ نەکەینەوە لەوەی داوای یارمەتی لە پسپۆڕانی ئەو بوارە بکەین، نابێت بە چەشنێک قسەی

لەگەڵدا بکەین هەستی تاوانبارییەکەی زیاتر بکەین، دەتوانین بەڕوونی پێی بڵێین: "ئەو چێژە سێکسییانەی مرۆڤ بە دەستی خۆی بەدەستیان دەهێنێت، زیانبەخشن. گەورەترین زیانیشی ئەوەیە دەبن بە خوو."

سەرەتا پێویستە ئەو سەرچاوانە دیاری بکەین کە بوونەتە هۆکاری وورووژاندنی سێکسی، پاشان یارمەتیی بدەین تاکو لێیان داببڕێت و دەستی پێیان نەگات.

**ئایا پێویست دەکات پێشتر زانیاری بدەین بە کوڕەکانمان سەبارەت بەو گۆڕانکارییە عاتیفییانەی کە لەگەڵ پێنانە ناو قۆناغی هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت؟**

نەخێر، پێویست ناکات.

ئاگادارکردنەوەی پێشوەختەی منداڵەکانمان سەبارەت بەو هەستانەی لە هەرزەکاریدا پێیان ئاشنا دەبێت، کارێکی بێسوودە. ئەو جۆرە زانیارییانە پاڵیان پێوە دەنێت بکەونە ناو هەڵەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی (بەهانەی هەرزەکاری) بۆ هەڵسوکەوتە نابەجێکانیان بهێننەوە.

کوڕان بە بینینی (خەونی هەرزەکار) دەچنە قۆناغی هەرزەکارییەوە. ئەو خەوانەی دەیبینن، چێژێکی وەهای پێ دەبەخشێت کە پێشتر نەیانچەشتووە. ڕەنگە بە هۆی ئەو خەونانەوە هەستی تاوانباریی لا دروست ببێت، چونکە پێشتر ئەو هەستانەی لا دروست نەبووە و تازەن بەلایەوە، بۆیە هەست بە پێویستیی شاردنەوەی خەونەکەی و ئەو هەستانەش دەکات کە لەو کاتەدا هەستی پێ کردووە.

> **باسکردنی ئەو حاڵەتانەی بەسەر هەرزەکاردا دێت بۆ منداڵێک کە هێشتا نەچووەتە ئەو قۆناغەوە، کارێکی زیادە و بێکەڵکە.**

لەو ڕووانـگـەیەوە، باسـکردنی کـۆمەڵە هەستێک بـۆ منداڵی پـێش هەرزەکـاری کە هێشـتا نازانێـت ئەو هەسـتانە چیـیە، بە کارێکی دروسـت دانانرێـت. تێگەیشتن لە هەسـت بە باسـکردن نابێـت، بە چەشـتن و هەستپێکردنی دەبێت. باسکردنی ئەو شتانە جگە لە کۆمەڵە زانیارییەکی بێسـوود، چیـی تـر نیـیە، ئەمە جـگە لەوەی دەیکـات بە پاساوێک بۆ خۆدەربازکردن لە سەرئەنجامی هەڵسوکەوتە نەخوازراوەکانی.

باسکردنی ئەو هەستانە بۆ منداڵانی پێش قۆناغی هەرزەکاری، باسکردنی کۆمەڵە هەستێکە کە ئەوان هیچ دەربارەی نازانن.

پێویسـتە ئاگـاداری ئەوە بـین لە سـەر بـابەتە سێکسییەکانیان بەرۆکیـان نەگرین و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەکەین، وازیان لێ بهێنین فێـر بـن خۆیـان کۆنترۆڵی هەستەکانیان بکەن.

ئامـادەکردنی ڕاسـتەقینەی ڕۆڵەکانمـان بـۆ قۆنـاغی هەرزەکـاری، بەوە دەبێـت لە تەمەنـی (٧) سـاڵییەوە هەنگاوبەهەنگـاو لەگەڵیانـدا بـین و پێداویسـتییە عاتیفییەکانیـان پشـتگوێ نەخەیـن، نەوەک بچـین پێشـوەختە هەرچی دەزانین دەربارەی سێکس بۆیان باس بکەین.

ئـارەزووی سێکسـی بۆخـۆی هەسـتێکە، هـیچ پێویـسـت ناکـات بەر لە چـوونە نـاو ئەو قۆناغەوە ئەو هەستەی پـێ بناسـێنرێت. بەڵام خۆپـاککردنەوە لە خەونبینـین، ئەوەی پێـی دەڵێین خۆشـتن یـان غوسـڵدەرکردن، یەکـێکە لەو ڕەفتارانەی کە ئەنجامدانیان پێویسـتە، بۆیە وەک بەشـێک لە ژیانمـان دەتـوانین لە زووەوە

لە تەمەنی (٧) ساڵییەوە ڕێنمایی منداڵەکانمان دەکەین کە لەگەڵ هەر خۆشتنێکدا، غوسڵیش دەربکەن.

فێریان بکەین. هەر لە تەمەنی (٧) ساڵییەوە ڕێنماییان دەکەین کە لەگەڵ هەر خۆشتنێکدا، غوسڵیش دەربکەن. بەو شێوەیە پێشوەختە لە سەر ئەو ڕەفتارانە ڕایاندەهێنین، کە لە هەرزەکاریدا پێویستیان پێی دەبێت. کاتێکیش دەکەوێتە ناو ئەو حاڵەتەوە، بە ئاسانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

**ئایا پێویست دەکات کیژانمان ئاگادار بکەینەوە سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی لە قۆناغی هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت؟**

بەڵێ.

بە پێچەوانەی کوڕانەوە، پێویستە زانیاری بدەین بە کچانمان دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ پێنانە ناو هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت، چونکە سەرەتای هەرزەکاریی ئەوان وەک کوڕان بە چێژی سێکسی دەست پێ ناکات، بەڵکو وەک دەزانین دەستپێکی باڵغبوونی کچان، گۆڕانکاریی فیسیۆلۆژییە.

بۆ نموونە؛ کاتێک دەچێتە تەمەنێکی دیاریکراوەوە، دەبێت ئەوەی پێ بوترێت کە وەک هەر کچێکی تر ئەویش سنگی گەورە دەبێت و سووڕی مانگانەی بەسەردا دێت. هەروەها دەبێت زانیاریی پێویستی بدرێتێ سەبارەت بەو جل و کەرەستانەی پێویستی پێیان دەبێت. دەبێت ئەوەشی بۆ ڕوون بکرێتەوە کە هەموو ئەو حاڵەتانە سروشتین و ترس و دڵەڕاوکەیان ناوێت. دەبێت باسی ئەوەی بۆ بکرێت کە هەموو کچێک لەو تەمەنەدا ئەو حاڵەتانەی

**پێویستە زانیاری بدەین بە کچانمان دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ پێنانە ناو هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت.**

بەسـەردا دێـت. لە کـاتی سـووڕی مانگـانەدا، دەبێـت کەرەسـتەکانی پـاکژیی پـێ بناسـێنین و شـێوازی بەکارهێنـانی تەندروستانەشیان بـۆ ڕوون بکەیـنەوە. کە پرسیاریشی کـرد دەربارەی ئەوەی ئایا هەموو ئافرەتێک ئەو شتانە بەکـار دەهێنێـت یـان نـا، پێویسـتە وەڵامـی ڕاسـت و دروسـتی بـدەینەوە. بەو شـێوەیە خـۆی وەک خانمێکی تازەپێگەیشتوو دەبینێت و لە دڵەڕاوکە ڕزگاری دەبێت.

> ئەگەر کچان زانیاریی پێویستیان نەبێت سەبارەت بەو گۆڕانکارییە فیسیۆلۆژییانەی لە هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت، هیچ دوور نییە گیرۆدەی ئاڵۆزیی دەروونی ببن.

جا لەبەر ئەوەی سەرەتای هەرزەکاریی کچان بە چێژی سێکسـی دەسـت پێ ناکات، بۆیە شتێک نییە ناوی شاردنەوەی هەستەکان بێت. بەڵام ئەگەر زانیاریی پێویستیان نەبێت سـەبارەت بەوەی ئەو گۆڕانکـارییە فیسـیۆلۆژییانە ئاسایین، ئەوکات هیچ دوور نییە گیرۆدەی ئاڵۆزیی دەروونی ببن.

زۆرێک لە کچان بە مەبەستی شاردنەوەی گەورەبـوونی سـنگیان، پشـتی خۆیان کۆم دەکەنەوە و پۆشـاکی فـراوان دەپۆشـن. کە دەشـکەونە سـووڕی مانگانەوە، لای کەس باسی نـاکەن، چونکە دەترسن کارێکی هەڵەیان ئەنجام دابێت.

> هیچ منداڵێک حەزی لەوە نییە لە ناو کەسانی تردا باسی ئەو بابەتانەی بۆ بکرێت، کە تایبەتن بە پرسە سێکسییەکانەوە.

ئەو هۆشـیارکردنەوەیەی کە لە پـێش هەرزەکاریـدا خێزانەکـان پێـی هەڵدەسـتن، پێویستە لەلایەن دایـک (یـان بـاوکەوە) بەتەنیـا ئەنجام بدرێت. هیچ منداڵێک حەزی لەوە نییە لە نـاو کەسـانی تـردا باسـی ئەو بابەتـانەی بـۆ

بکرێت، کە تایبەتن بە پرسە سێکسییەکانەوە.

بەدەر لەوە، پێویستە لەبارەی پێکهاتەی جەستەیی کچانەوە زانیاری بدەین بە کچەکانمان، هەروەها ئاگاداریان بکەینەوە لە زیانی هەر هەڵسوکەوتێکی ناتەندروست لەگەڵ ئەو پێکهاتەیەدا، بەتایبەت لەو کاتانەدا کە هەست بە ورووژانی سێکسی دەکەن.

## چۆن بە منداڵەکانمان بڵێین مووی جەستەیان لا ببەن؟

وەک دەزانن لەگەڵ هەرزەکاریدا، چەند شوێنێکی دیاریکراوی جەستەی منداڵ مووی لێ دەردێت، ڕەنگە منداڵ نەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو موانەدا بکات. کاری دایک و باوک ئەوەیە لەو جۆرە حاڵەتانەدا دەستی منداڵەکانیان بگرن، بەڵام دەبێت بە شێوەیەک بەو کارە هەستن، سنوورە کەسییەکانیان پێشێل نەکەن. بۆ نموونە؛ دەتوانن سوود لە بووکەڵە وەربگرن بۆ نیشاندانی چۆنێتی تاشینی ئەو موانە.



**بە هیچ شێوەیەک دروست نییە دایک و باوک هەستن بە پاککردنەوەی مووی جەستەی منداڵێک، کە پێی ناوەتە هەرزەکارییەوە.**



بە هیچ شێوەیەک دروست نییە دایک و باوک هەستن بە پاککردنەوەی مووی جەستەی منداڵێک، کە پێی ناوەتە هەرزەکارییەوە.

چ کچان، چ کوڕان، دەتوانن کرێمی موولابەر بەکار بهێنین بۆ لابردنی مووی هەرزەکاری لە جەستەیان.

## ئایا پێویست دەکات زانیاری بدرێت بە هەرزەکار دەربارەی ڕەگەزی بەرامبەر؟

نەخێر.

تێپەڕبوونی بێ کێشەی قۆناغی هەرزەکاری، پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بەوەی کە تا چ ئاستێک فێری ئەوە بوون لەگەڵ گۆڕانکارییە عاتیفی و فیزیکییەکانی قۆناغەکەدا هەڵبکەن. خۆتان دەزانن هەرزەکار دڵی لێدەدات بۆ ڕەگەزی بەرامبەر، بۆیە پێویست ناکات قسە لە سەر هەست و جەستەی ڕەگەزی بەرامبەر بکەین و کۆمەڵە بابەتێک بورووژێنین کە ئەو ئارەزووە قووڵتر دەکاتەوە.

منداڵ لەو تەمەنەدا هەست و ئاڵوگۆڕە سۆزدارییەکانی خۆی بەزەحمەت پێ کۆنترۆڵ دەکرێت، جا تۆیش دێیت و هەستەکانی ڕەگەزی بەرامبەریشی تێکەڵ دەکەیت، مەردم دەوێت لێی بێتە دەر.

لە لایەکی ترەوە، کاتێک هەرزەکار بۆی دەردەکەوێت کە پێکهاتەی جەستەیی ڕەگەزی بەرامبەر لە هی ئەو جیاوازترە، پەرۆشی بۆ دروست دەبێت و حەز دەکات بزانێت جیاوازییان چییە، بۆ ئەو مەبەستە دەکەوێتە گەڕان و سۆراغ. لەبارترین سەرچاوەی بەدەستهێنانی ئەو جۆرە زانیارییانەش، ژینگەی ناتەندروستی ئینتەرنێتە.

**منداڵی هەرزەکار تەنها لەبارەی جەستەی خۆیەوە زانیاریی دەدرێتێ، دروست نییە دەربارەی پێکهاتەی جەستەیی و لەشولاری کەسانی تر زانیاریی بدرێتێ.**

لەبەر ئەوە تا ئەو قۆناغە گوزەر دەکات، پێویست ناکات مێشکی منداڵەکانمان بە چۆنێتیی جەستەی ڕەگەزی بەرامبەر و بارە دەروونییەکانیەوە سەرقاڵ بکەین.

کاتێکیش ئەو قۆناغەیان بەسەرکەوتوویی تێپەڕاند و هەستەکانیان هاوسەنگ بووەوە، وەک چۆن لەبارەی لایەنەکانی تری ژیانەوە زانیارییان دەدەینێ، هەر بەو شێوەیە دایک و باوک دەتوانن لە سەر شێوەی گفتوگۆی نێوان دوو کەسی (پێگەیشتوو)، سەبارەت بە دونیای کچان و کوڕان ئەو زانیارییانەیان پێ ببەخشن کە پێویستیانە.

## ئایا تا چەند ڕاستە وەڵامی پرسیاری منداڵەکانمان بدەینەوە، کە دەربارەی ژیانی سێکسی دەیکەن؟

ژیانی سێکسی حاڵەتێکی تایبەتە، شتێک نییە کەسانی تر ئاگاداری بن.

ئەو تایبەتبوونەش تەنها گفتوگۆی نێوان منداڵ و گەورە ناگرێتەوە، بەڵکو بەسەر گفتوگۆی نێوان گەورەکان خۆیشیاندا دەچەسپێت.

ژیانی سێکسی بابەتێک نییە هەر وا بەئاسانی لە هەموو کۆڕێکدا و لای هەموو کەسێک باس بکرێت.

**مەگەر تەنیا لە دوای قۆناغی هەرزەکاری زانیاری بدرێت بە منداڵ سەبارەت بە ژیانی سێکسی، ئەویش بەو ئەندازەیەی پێویستی پێی دەبێت.**

یەکێک لە بنەما گرنگەکانی پێدەگۆژی، پێدانی زانیارییە بەو ئەندازەیەی کە منداڵ پێویستیەتی، نەک باسکردنی هەر شتێک کە ئەو خوازیاری زانینی بێت. زانیاری سەبارەت بە ژیانی سێکسییش، لە جۆری ئەو زانیارییانە نییە کە منداڵ پێویستیەتی.

گەورەکان ناچار نین وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە منداڵان دەربارەی ئەو بابەتە دەیکەن، ڕەنگە وەڵامی دروست بۆ ئەو چەشنە پرسیارانە ئەوە بێت بڵێین: "ئەم جۆرە بابەتانە تایبەتن بە ژیانی کەسیی تاکەکانەوە، بەڕاستی نازانم قسەی لە سەر بکەین."

جاری وایە لە وەڵامدا پێیان دەڵێین: "جارێ تۆ تەمەنی ئەو باسانەت نەهاتووە"، یان "خۆت لە داهاتوودا وەڵامت دەست دەکەوێت"، دەبێت بزانین ئەو جۆرە وەڵامانە پەرۆشییەکەیان زیاتر دەجووڵێنێت.

جگە لەوە، هەڵوێست و ئاماژەی ڕووخسار و زمانی جەستەی ئەو دایک و باوکە زۆر گرنگە کە ئەو پرسیارانەی ئاڕاستە کراوە. بزەی ژێر لێو، سوورهەڵگەڕان لە شەرمدا، یان تووڕەبوون، هەرگیز شێوازی دروستی وەڵامدانەوە نین.

لێرەدا ئەوەی منداڵ پێویستە گوێی لێ بێت، ئەمەیە: "ئەم بابەتە تایبەتە بە ژیانی کەسیی تاکەکان، کارێکی دروست نییە بمانەوێت ئاگاداری ژیانی تایبەتیی کەسانی تر بین."

**ئەم جۆرە وەڵامانە: "جارێ تۆ تەمەنی ئەو باسانەت نەهاتووە!"، "ئەوە کەی پرسیاری تەمەنی تۆیە!"، یان "خۆت لە داهاتوودا وەڵامت دەست دەکەوێت..."، پەرۆشیی منداڵ زیاتر دەجووڵێنن.**

لە پاڵ ئەمەدا، بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لە ژیانی هاوسەریدا ئەزموونێکی تەندروستی ژیانی سێکسییان هەبێت، وا باشە بەر لە هاوسەرگیری، ڕوونکردنەوەیان بدەینێ. بۆ ئەم بابەتە پێویستمان بە (هاوڕازێکە) کە تەواوی وردەکارییەکانی ئەو پرۆسەیەی بۆ باس بکات و لە یەک دانیشتندا زانیاریی دروستی بداتێ.

ئایا هاوڕێیەتی نێوان کچ و کوڕ لە قۆناغی قوتابخانەدا ئاساییە؟ دەتوانین بڵێین بناغەی ئەو پەیوەندییە، پاڵنەری سێکسییە؟

نەخێر، پاڵنەری سێکسی لەئارادا نییە.

هاوڕێیەتیی قۆناغی قوتابخانە بە شێوەیەکی گشتی لە سەر بنەمای (ناڕەگەزییە)، واتە پەیوەندی بە سێکسەوە نییە. بەتایبەتی خەم و دڵەڕاوکە بە هۆی هاوڕێیەتیکردنی کچان و کوڕان لە قۆناغەکانی باخچەی ساوایان و سەرەتاییدا کە هیچ زانیارییەکیان نییە سەبارەت بەو بابەتانە، لە جێی خۆیدا نییە. گاڵتە و گەمەی منداڵانی ئەو تەمەنە، هیچ جۆرە پاڵنەر و ئارەزوویەکی سێکسی لەخۆ ناگرێت. بۆیە هیچ پێویست بەوە ناکات لە ڕێگەی قەدەغەکردن و ڕوانینی گومانلاوییەوە، ئەو هەستەیان لا دروست بکەین کە ئەوان سەر بە دوو ڕەگەزی جیاوازن و دەبێت ئاگاداری یەکتری بن، چونکە ئاڕاستەکردنی ئەو هەستە بۆ منداڵ قورسە.

> بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لە ژیانی هاوسەریدا ئەزموونێکی تەندروستی ژیانی سێکسییان هەبێت، وا باشە بەر لە هاوسەرگیریی ڕوونکردنەوەیان بدەینێ.

هەروەها دەبێت ئەوەندە ڕۆشنبیریمان هەبێت، بزانین منداڵانی قۆناغی سەرەتایی زۆر لەبارن بۆ لاساییکردنەوە و لەو ڕێگەیەوە درێژە دەدەن بە گەشەکردنیان. بۆیە ئەگەر لە نێوان خۆیاندا دیمەنی ئەو خۆشەویستی و دڵدارییانەیان دووبارە کردەوە کە لە تەلەڤزیۆندا بینیویانە، ئەوەندە بەسە بزانین کە ئەوە تەنیا لاساییکردنەوەیە و پەیوەندیی بە ئارەزووی سێکسییەوە نییە.

> لێکدانەوەی سێکسییانە بۆ هاوڕێیەتیی نێوان کچان و کوڕان، لێکدانەوەیەکی چەوتە.

بەڵام پەیوەندیی هاوڕێیەتیی نێوان کچان و کوڕان بۆ منداڵانی قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، ئەگەری پاڵنەری سێکسیی تێدایە -لەگەڵ ئەوەدا کە لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی دیکە و بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی تێیدا پەروەردە بووە دەگۆڕێت- گرنگ ئەوەیە وەک کەسانی پێگەیشتوو هاوکاریان بین و سەرنجیان بۆ لای شتانی بەسوود وەربچەرخێنین. کارابوونی منداڵ لە کۆمەڵە بوارێکی وەک وەرزش و هونەردا کە دەتوانێت لە ڕێگەیانەوە گوزارشت لە خۆی بکات، باشترین چارەسەرە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئارەزووە سێکسییەکان.

هاوکات نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە لاوازیی پەیوەندییەکانی ناو خێزان، دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵان لە پەنجەرەی ڕۆمانسیەت و سێکسەوە بڕواننە هاوڕێیەتیی نێوان هەردوو ڕەگەز. بەهێزکردنی پەیوەندییە خێزانییەکان، ڕێگرە لە بەردەم ئەوەی منداڵان سەرنجیان بە لای ئەو جۆرە پەیوەندییە ناتەندروستانەدا بچێت.

**کارابوونی منداڵ لە کۆمەڵە بوارێکی وەک وەرزش و هونەردا کە دەتوانێت لە ڕێگەیانەوە گوزارشت لە خۆی بکات، باشترین چارەسەرە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئارەزووە سێکسییەکان.**

**گرنگیدان بە توندوتۆڵکردنەوەی پەیوەندیی نێوان ئەندامانی خێزان، باشترین چارەسەرە بۆ ئەوەی منداڵ لەو ئارەزووە سێکسییانە بەدوور بێت کە هی تەمەنی خۆی نین.**

## ئایا هاوڕێیەتیی منداڵێك كە ئارەزووی سێكسیی لەڕادەبەدەری هەیە لەگەڵ هاوڕەگەزەكانیدا، زیانی هەیە بۆ سەر گەشەی سێكسیی ئەو منداڵە؟

بێگومان هەیەتی.

ئەو منداڵەی پێش تەمەنی خۆی كەوتووە و زیاد لە پێویست هەڵچوونی سێكسیی هەیە، تەنها زیان بە خۆی ناگەیەنێت، بەڵكو كاریگەریی خراپ لە سەر هاوڕێ نزیكەكانیشی جێ دەهێڵێت.

دەبێت وریا بین، چونكە هەستە سێكسییەكان لە نێوان ئەو كەسانەدا كە پەیوەندیی هاوڕێیەتیی نزیكیان هەیە، ئاڵوگۆڕ دەكات. ئەو ئاڵوگۆڕانەش لە نێوان منداڵاندا زووتر و زۆرتر ڕوو دەدەن، تاوەكو گەورەكان، بۆیە هەر لە دێرزەمانەوە وتراوە: "پێم بڵێ هاوڕێكەت كێیە، پێت دەڵێم تۆ كێیت." دەبێت دایكان و باوكان بزانن كە هەستە سێكسییەكان، سیفەتی ئاڵوگۆڕكێ و گواستنەوەیان هەیە لە یەكێكەوە بۆ یەكێكی تر.

> هاوڕێیەتیی ئەو منداڵانەی ئارەزووی سێكسیی زیاد لە پێویستیان هەیە، كاریگەریی خراپی هەیە لە سەر منداڵ.

هەڵبەتە ئەم حاڵەتە تەنیا لە پەیوەندیی نێوان منداڵاندا بەرچاو ناكەوێت، بگرە ئەمە بۆ ئەو حاڵەتانەش ڕاستە كە كەسێكی پێگەیشتوو لە پاڵ منداڵێكدا هەستە سێكسییەكانی دەجووڵێن، واتە ئەو هەستانە لە كەسە پێگەیشتووەكەوە دەگوازرێنەوە بۆ منداڵەكە. بۆ نموونە؛ ئەگەر پیاوێك لە بەرچاوی منداڵێكدا بە جۆرێك هەڵسوكەوت بكات (جا جووڵاندنی لێوی بێت یان ئەندامەكانی جەستەی) كە بۆنی ئارەزووی سێكسیی لێبێت، منداڵەكەش دەكەوێتە ژێر كاریگەریی ئەو هەستە سێكسییانەوە، هەمان شت بۆ ئەو فیلم و

دیمەنە سێکسییانەش ڕاستە کە منداڵ تەماشایان دەکات. ئەو شتەی ئێمە لێرەدا باســی دەکەیــن، شــتێکی تەواو جیــاوازە لەو پەیوەنــدییانەی کە ســۆز و خۆشەویستیی باڵادەستە تیایانــدا. هەر هەڵسوکەوتێک سۆز و خۆشەویستیی تێدا بێت، جا دیمەنێکی هەستبزوێنی نــاو فیلمێک بێت یان گفتوگۆیەکی پڕخۆشەویستیی نێوان ژن و مێرد، هەستی ئەرێنی لای منداڵ دروست دەکات. بەڵام گۆڕانی هەستی خۆشەویستی بۆ هەستی سێکسی، هەڵچوونی سێکسی لەو منداڵەدا دەهێنێتە کایەوە.

ئەو هەستە سێکسییانەی لای کەسانی نزیکی منداڵ دروست دەبێت، ڕاستەوخۆ لە سەر شێوەی (هەست) دەگوازرێتەوە بۆ هەستەکانی منداڵ، واتە لاســاییکردنەوە لەگۆڕێــدا نیــیە. ئەو هەستە سەیر و نــاڕوونە، کە لە هەمــان کاتــدا هەســتێکی ســەرنجڕاکێش و ڕاکێشەریشــە، دەبێــتە هــۆی ئەوەی ئەو منــداڵە ئاشــنایەتی لەگەڵ هەســتە سێکســییەکاندا بکــات، ئەو هەستانەی کە ئاڕاستەکردنیان لەو تەمەنەوە تا بڵێی زەحمەتە بۆ منداڵ.

> **گۆڕانی هەستی خۆشەویستی بۆ هەستی سێکسی، هەڵچوونی سێکسی لە منداڵدا دەهێنێتە کایەوە.**

ئەوەش بۆخۆی ڕاستییەکە کە گەنجــان - وەک بەشێک لە داخوازی گەشەکردنیان- لاسایی ئەو هاوڕێیانەیــان دەکەنەوە کە خــاوەنی هەڵســوکەوتی نائاســایی و ســنووربەزێنن. بەو ورەیەی لەوانەوە وەریدەگرن، درێژە بە گەشەی کەسێتیی خۆیان دەدەن. گرفتەکە کاتێک ســەر هەڵدەدات، کە سەرکەشیی سێکسی بەشێک بێت لە ڕەفتاری ئەو هــاوڕێ سنوورشکێنانە. بۆیە هەر ئەوەندەی هەستمان بە دۆخێکی لەو جۆرە کــرد، دەبێــت بە زووتــرین کــات ڕێوشــوێنی پێویســت بگــرینە بەر و یــارمەتیی

ڕۆڵەکانمان بدەین تاکو پێداچوونەوە بە ئاستی هاوڕێیەتییەکەیاندا بکەن لەگەڵ ئەو چەشنە کەسانەدا.

بەتایبەتی لە قۆناغی هەرزەکاریی بەراییدا کە دەکاتە تەمەنی (١٠-١٤) ساڵی؛ پێویستە دایکان و باوکان بەرچاوڕۆشنییەکی دروستیان هەبێت دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەست و ڕەفتاری ڕۆڵەکانیاندا دێتە مەیدان. ئەگەر شتێکیشیان لێ ئاڵۆسکا، دەتوانن سوود لە هاوکاریی کەسانی پسپۆڕ وەربگرن. زۆر گرنگە سەرپەرشتیاران لە قۆناغی هەرزەکاریی بەراییدا -کە هەستیارترین سەردەمی منداڵە بەرامبەر ئارەزووی سێکسی- بزانن منداڵەکانیان هاوڕێیەتیی کێ دەکەن و لەگەڵ کێدا کات بەسەر دەبەن. بۆیە لەم سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین، بایەخدان بە پەروەردە و هەستەکانی ئەوانیش دیسانەوە لە بازنەی بەرپرسیارێتیی دایکان و باوکاندایە.

**ئەو کەسانەی لەگەڵ منداڵدان، ئەگەر هەستی سێکسییان لە لا دروست ببێت، ڕاستەوخۆ ئەو هەستەیان دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەکە.**

### چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو منداڵانەدا بکەین، کە بەدزییەوە چاودێریی ژووری کچان (یان کوڕان) دەکەن؟

کرداری چاودێریکردن بەگوێرەی قۆناغەکانی تەمەن، سێ هۆکاری جیاوازی هەیە:

#### ١. پێش تەمەنی (٧)ساڵی؛ حەزی زانین و پەرۆشی

ئەم ڕەفتارە لای ئەو منداڵانە بەدی دەکرێت، کە بەربەست خراوەتە نێوان خۆی و ئەو خوشک و برایانەیەوە کە لە ڕەگەزی خۆی نین. منداڵی خوار

تەمەن (٧)ساڵ، دەبێت لە سەر بنەمای نزیکی و خوشک و برایەتی و بێ بەربەستی لەگەڵ یەکتریدا بجووڵێنەوە. مادەم لە سەر یەک جێگە ناخەون و پێکەوە ناچنە تەوالێت و گەرماوەوە، مانای وایە کێشە نییە. ئەو منداڵانەی لە خوشکەکانیان جیا کراونەتەوە، یان ئەوانەی لە براکانیان دوور خراونەتەوە، دەبینیت پەرۆشییان بۆ دروست دەبێت و لە سووچی دەرگا یان شوێنی کلیلەوە سەیری خوشک و براکانیان دەکەن.

کە ڕووبەڕووی حاڵەتێکی لەو جۆرەش بووینەوە، پێویست ناکات خۆمان سەغڵەت بکەین، یان مەسەلەکە گەورە بکەین و لە دیدگای ئارەزووی سێکسییەوە شرۆڤەی بکەین، ئەوەندە بەسە بە (زمانی کردار) ئەوەی تێبگەیەنین کە ئەو ڕەفتارە ڕەفتارێکی دروست نییە.

**ئەو منداڵانەی لە خوشکەکانیان جیا کراونەتەوە، یان ئەوانەی لە براکانیان دوور خراونەتەوە، دەبینیت پەرۆشییان بۆ دروست دەبێت و لە سووچی دەرگا یان شوێنی کلیلەوە سەیری خوشک و براکانیان دەکەن.**

ئەو زمانە کردارییەی کە شیاوی ئەم حاڵەتەیە، بریتییە لە: "بەدزییەوە سەیرکردنی ژووری کەسانی تر، ڕەفتارێکی پەسەند نییە."

ئەو دایک و باوکانەی تێبینیی ئەم حاڵەتە دەکەن لە منداڵەکانیاندا، پێویستە سەرلەنوێ پێداچوونەوە بکەن بەو شتانەی قەدەغەیان کردووە و ئەو بەربەستانەی خستوویانەتە نێوان منداڵەکانیانەوە، جگە لەوەی دەبێت گرنگیی زیاتر بدەن بە پەیوەندی و نزیکیی نێوان منداڵەکانیان.

## ٢. سەروو تەمەنی ٧ ساڵ؛ توندوتیژی و پشتگوێخستن

لە دوای تەمەنی حەوتساڵی و قۆناغی پێش هەرزەکاری، ناوەڕۆکی سەیرکردنەکە گرنگە. وەک چۆن بۆی هەیە لە زۆر (نازپێدان)ەوە سەرچاوەی گرتبێت، هەر بەو شێوەیەش دەکرێت هەڵسوکەوتێکی نائاسایی ناوەڕۆک سێکسی بێت، کە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی منداڵەکە لە ناخی خۆیدا دونیایەکی شاراوە و ناسنامەیەکی ساختەی بۆ خۆی دروست کردبێت، ئەگەر هاتوو منداڵێک لە هەموو دەرفەتێکدا حەزی دەکرد (بەدزییەوە) چاودێریی ژوور و گەرماو و تەوالێتی خوشک و براکانی بکات، ئەوکات دەبێت بەوردی لە ڕەگوڕیشەی ئەو هەڵسوکەوتە نائاساییە بکۆڵینەوە و سوود لە ئەزموون و بەرچاوڕوونیی پەروەرشیاران وەربگرین.

> لە دوای تەمەنی حەوت ساڵی و قۆناغی پێش هەرزەکاری، ئەوە گرنگە سەیری چی دەکات.

لە لایەکی ترەوە، بۆی هەیە ئەو حەزەی منداڵ بۆ چاودێریکردنی جەستە و ژیانی تایبەتیی کەسانی تر هەیەتی، ئاماژەیەک بێت بۆ ئەو ناتەواوییەی کە لە پێکهاتەی خێزانەکەدا هەیە. ئارەزوو و ئاڕاستەکانی ئەو قۆناغە، بەگشتی لەو تاکانەدا بەدی دەکرێت کە فەرامۆش کراون، یان (گەشەی عاتیفییان) بە شێوەیەکی تەندروست بەرەوپێش نەچووە و پەیوەندییە خێزانییەکانیان لاوازە. بەڵام جاری وا هەیە پەیوەندییە خێزانییەکانیش بەهێزن، بەڵام ئەو ڕەفتارە هەر هەیە. هۆکاری ئەوە ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زەمینەی بزواندنی پەرۆشیی منداڵ بۆ ژیانی سێکسی ڕەخسێنراوە، ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەو پەرتووک و گۆڤار و فیلمانەی کە بە شێوەیەکی بەربڵاو و بێکۆنترۆڵ لە ناوماڵدا دێن و دەچن.

هەندێك جاریش منداڵان لە ژێر کاریگەریی دەوروبەر و باسکردنی ئەو بابەتانە لە نێوان خۆیاندا، پەلکێشی ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە دەبن.

ئەمە جگە لەوەی پەرۆشیی سێکسی، لە هەمان کاتدا جۆرێکە لە جۆرەکانی خۆخافڵاندن. لەوانەیە لە ڕێگەی ئەنجامدانی ڕەفتارێکی هەڵە یان شکاندنی یاساغێکەوە، جۆشوخرۆشێک لە ناخیدا دروست ببێت و لە ئەنجامی ئەوەشدا هەست بە باشی بکات. زۆر جاریش سەرکەشی و تاقیکردنەوەی ئەو شتانەی جۆشوخرۆش دروست دەکەن، دەبێتە جۆرێک لە خۆخافڵاندن بۆ ئەو منداڵانەی کە قوربانیی دەستی توندوتیژین. وە نەبێت ئەو جۆرە منداڵانە تەنیا سەرقاڵی چاودێری کردنی کەسانی تر بن، بەڵکو بەبێ مۆڵەت کەلوپەلی کەسانی تریش دەبەن و بە کاری نهێنی و نایاساییشەوە تێوە دەگلێن، ئیدی بەو شێوەیە سەرکەوتوو دەبێت لە چەپاندن و کپکردنەوەی ئەو نائارامییەی کە ناخی تەنیوە.



**بۆی هەیە ئەو حەزەی منداڵ بۆ چاودێریکردنی جەستە و ژیانی تایبەتیی کەسانی تر هەیەتی، ئاماژەیەک بێت بۆ ئەو ناتەواوییەی کە لە پێکهاتەی خێزانەکەیدا هەیە.**



ئەگەر لە خێزانێکدا هەست کرا یەکێک لە منداڵەکان بەدزییەوە چاودێریی خوشک و براکانی دەکات، یەکەم هەنگاوی چارەسەر ئەوەیە پەیوەندیی نێوان ئەندامانی ئەو خێزانە پتەوتر بکرێت و کۆتایی بهێنرێت بە گشت جۆرەکانی فشار و توندوتیژی و زۆرلێکردن. لەبری ئەوەی خۆیشمان لەبارەی ئەو بابەتەوە قسەی لەگەڵدا بکەین، باشتر وایە پەنا بەرینە بەر هاوکاریی کەسانی پسپۆڕ تاکو دەست بخەنە سەر ڕەگوڕیشەی گرفتەکە.

### ٣. قۆناغی هەرزەکاری؛ توندوتیژی و ئارەزووی سێکسی

تێبینیکردنی ئەم خووە لە منداڵانی هەرزەکاردا، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو پاڵنەرە سێکسییانەی کە نەیانتوانیوە کۆنترۆڵی بکەن، وەک چۆن دەگونجێت هەوڵێک بێت بۆ خۆخڵافاندن و سەرنانەوەی هەستە ناخۆشەکانیان، چونکە ئێمە دەزانین خوودانە سێکس، یەکێکە لەو ڕێگایانەی بەکار دەهێنرێت بۆ کپکردنەوەی هەستە بریندارکەرەکان.

**پەرۆشیی سێکسی، جۆرێکە لە جۆرەکانی خۆخافڵاندن. لەوانەیە منداڵ لە ڕێگەی ئەنجامدانی ڕەفتارێکی هەڵە یان شکاندنی یاساغێکەوە، جۆشوخرۆشێک لە ناخیدا دروست ببێت و لە ئەنجامی ئەوەشدا هەست بە باشی بکات.**

خووی چاودێریکردنی حاڵەتە تایبەتییەکانی کەسانی تر، خوویەکە لە ئەنجامی کۆنترۆڵنەکردنی هەستە سێکسییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە گرنگترین هەنگاو ئەوەیە دەستی بگرین و یارمەتیی بدەین لە کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنی هەستەکانیدا. بۆ نموونە؛ هەڵوێستەکردن لە سەر بەها مرۆیی و ئەخلاقییەکان و توندوتۆڵکردنەوەی هاوبەندە خێزانییەکان؛ دەتوانن ببنە چارەسەر بۆ ئەو گرفتە.

**بایەخدان بە بەها مرۆیی و ئەخلاقییەکان و توندوتۆڵکردنەوەی هاوبەندە خێزانییەکان، باشترین چارەسەرن بۆ گرفتی چاودێریکردن.**

لە حاڵێکدا ئەگەر هەستمان بە هەڵسوکەوتێکی لەو جۆرە لە منداڵەکانماندا کرد، باشتر وایە بە زووترین

کات پەیوەندی بکەین بە پسپۆڕانی بوارەکەوە، نەک بیدەینەوە بەچاویدا و بیکەینە دەمەقاڵێ لەگەڵیدا.

چی بکەین ئەگەر منداڵەکەمان واتای ئەو وشانەی پرسی، کە ناوەرۆکی سێکسییان هەیە؟

منداڵان لە ڕێگەی لاساییکردنەوەی یەکتر و گومانبردنیان بەوەی کە (شتێکی باش دەکەن)، فێری ئەو جنێو و قسە ناشیرینانە دەبن، کە ئاماژەی سێکسییان تێدایە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە بەشێکی گرنگ دادەنرێت بۆ گەشەکردنیان، ئەوە ناهێنێت بیکەین بە کێشە بۆ خۆمان.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئاگاداریان بکەینەوە کە ئەو جۆرە وشە و دەستەواژانە "لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکار ناهێنرێن" و "بەکارهێنانیشیان پەسەند نییە"، بێ ئەوەی بچینە ناو وردەکاریی واتاکانیانەوە.

هەندێك جار واتاکەشی دەزانن، بەڵام لەبەر خۆنواندن هەر بەکاری دەهێنن.

لەم بارەدا پێویستە گەورەکان واتای وشەکان پووچەڵ بکەنەوە، چونکە کاتێك ئەو وشانە بەکار دەهێنێت، دەوروبەرەکەی چەندە کاردانەوەیان هەبێت و سەرسوڕمانی خۆیان دەربخەن، ئەویش ئەوەندە دەجۆشێت و (بۆ خۆشی) بەردەوام دەبێت لە سەر بەکارهێنانی. گرنگترین شت لەو حاڵەتانەدا ئەوەیە، خۆمان تێک نەدەین و بە ئاماژەی ڕووخساریش بێت کاردانەوە نەنوێنین. واتە بە جۆرێک هەڵسوکەوت بکەین، وەک ئەوەی هیچمان لێ

**ئەو دەستەواژانەی واتای سێکسییان هەیە و منداڵ بەکاریان دەهێنێت، بە گرنگیپێنەدان و فەرامۆشکردنیان واتاکانیان پووچەڵ دەبنەوە.**

نەبیستبێت، بەو جۆرە جنێوەکەی مەحکومی بێمانایی دەکەین، ئیتر ئەویش بە تێپەڕبوونی کات واز لە دووبارەکردنەوەیان دەهێنێت.

لە دوای تەمەنی ٧ساڵیش، بێ نیشاندانی هیچ جۆرە سەرسامییەک، بە زمانی کردار بۆی ڕوون دەکەینەوە کە بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانە کارێکی دروست نییە.

## منداڵەکەم دەڵێ "من عاشق بووم"، چۆن لەگەڵیدا بجووڵێمەوە؟

بەر لە تەمەنی ٧ ساڵی، گەنجینەی وشەی منداڵان ئەوەندە دەوڵەمەند نییە بزانن چ هەستێک بە چ وشەیەک دەرببڕن.

زۆر جار بە وشەی (عەشق) گوزارشت لە خۆشەویستی دەکەن و لەبری وشەی دڵتەنگی؛ (ڕق) و لەبری فەرامۆشکردنیش؛ (خۆشنەویستن) بەکار دێنن.

منداڵ پێویستی بەوەیە بە ڕاست و دروستی گوزارشت لە هەستەکانی بکات و دەستەواژەی پڕ بە پێستی خۆیانیان بۆ بەکار بهێنێت. ئەگەر بەهەڵەش وشەیەکی بەکار هێنا، پێویستە لێی تووڕە نەبین، بەڵکو بەپێچەوانەوە، زەردەخەنەی بەڕوودا بنوێنین و وشە ڕاستەکەی بۆ پێشنیار بکەین.

خۆ ئەگەر منداڵ لە سەروو تەمەنی ٧ ساڵییەوە بێت، ئەگەری ئەوە هەیە لە ڕێگەی لاساییکردنەوەوە فێر بووبێت. لە میدیا و دەوروبەرەکەیەوە بیستوویەتی و هەوڵ دەدات لاساییان بکاتەوە. تا ئێرە هیچ گرفتێک لەئارادا نییە، چونکە گەشەکردنی داخوازی ئەوەیە. تا ئەو وشانە بەکار بهێنێت کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەیانبیستێت، بوونی

> عەشق وشەیەک نییە واتای سێکسی هەبێت، وشەیەکە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی بەکار دێت.

خۆی زیاتر دەسەلمێنێت، ئەوەش بۆخۆی پاڵنەرێکی ناوەکییە.

ئەگەر منداڵ لەو تەمەنەدا (عاشقبوون) ی خۆی ڕاگەیاند، دەبێت بکەوینە گفتوگۆ لەگەڵیدا تاکو یارمەتیی بدەین دەستەواژەیەکی دروست بۆ دەربڕینی ئەو هەستەی بدۆزێتەوە.

“ ئەگەر منداڵ (عاشقبوونی) خۆی ڕاگەیاند، دەبێت بکەوینە گفتوگۆ لەگەڵیدا تاکو یارمەتیی بدەین دەستەواژەیەکی دروست بۆ دەربڕینی ئەو هەستەی بدۆزێتەوە. ”

هەروەها دەبێت ئەوەی بۆ ڕوون بکەینەوە کە عەشق هەستێکی جوانە و تەنیا پەیوەندیی سۆزداریی نێوان کچ و کوڕ ناگرێتەوە، بەڵکو بە خۆشەویستیی دایک بۆ منداڵەکەی و، تاک بۆ بەها مەعنەوییەکانیش هەر دەوترێت عەشق. ئەوجا دەتوانین لە ڕێگەی باسکردنی عەشقی خودایی و عەشقی ئەو کارەوە کە دەیکەین، قاڵبێکی تازە بۆ وشەی عەشق لە بیریدا دابڕێژینەوە، ئیتر بەو شێوەیە (عاشقبوونی منداڵ) بەرامبەر هاوڕێکەی ناگۆڕێت بۆ هەڵچوونێکی سێکسی بەرامبەر ڕەگەزی بەرامبەر.

دیسانەوە زۆر گرنگە ئاگاداری ئەوە بین منداڵانمان لە کوێوە فێری ئەو وشانە دەبن و سەرچاوەی مەیلە عاتیفییەکانیان چ شتێکە.

ئەگەر پێویستیشی کرد دەتوانین هانیان بدەین لەبری وشەی عەشق، وشەی خۆشەویستی بۆ ئەو هاوڕێیانەیان بەکار بهێنن کە پەیوەندیی نزیکیان لەگەڵیاندا هەیە.

“ ئەگەر پێویستی کرد دەتوانین هانی منداڵەکانمان بدەین لەبری وشەی (عەشق)، وشەی (خۆشەویستی) بۆ ئەو هاوڕێیانەیان بەکار بهێنن کە پەیوەندیی نزیکیان لەگەڵیاندا هەیە. ”

## چی بکەین، ئەگەر منداڵەکەمان هاوڕێیەتیی ڕەگەزی بەرامبەری دەکرد؟

هاوڕێیەتیکردنی کچ یان کوڕ، شتێک نییە ببێتە مایەی سەغڵەتبوونی دایکان و باوکانی ئازیز، گرنگ ئەوەیە لەو پەیوەندییەدا منداڵەکە تا چەند دەتوانێت هەستەکانی کۆنترۆڵ بکات. ئەو منداڵەی لە سەر بنەماکانی (پەروەردەی مەحرەمیەت) گۆش کراوە، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە قوتابخانە، یان لە کۆڵاندا، ئەوە ناکات بە کێشە کە ئایا هاوڕێکانی کچن یان کوڕ. هەوڵ نادات لە پاکیزەترین قۆناغەکانی تەمەندا کە منداڵییە، بەگوێرەی جیاکاریی نێوان ڕەگەزەکان بجووڵێتەوە. بیرمان نەچێت، توانای پێکەوەژیان و پەیوەندیبەستن لە سەر بناغەی مرۆڤ-مرۆڤ، بەهێزترین تایبەتمەندیی سەردەمی منداڵییە.

> کێشەکە لەوەدا نییە ببنە هاوڕێ، کێشەکە لەوەدایە ئەو هاوڕێیەتییە بگۆڕێت بۆ نزیکبوونەوە و ئارەزووی سێکسی.

لە پاڵ ئەمەدا، منداڵان لە ناو ژینگەی هاوڕێیەتیدا قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن و ئاڵوگۆڕی بابەت و ئارەزووەکانیان دەکەن. ئەوەی لێرەدا دەبێتە جێی پرسیار، زیاد لە هاوڕێیەتیکردنی ڕەگەزی بەرامبەر، شرۆڤەکردنی ئەو پەیوەندیی هاوڕێیەتییەیە لە چاویلکەی سێکسەوە.

هەندێك جار دایکان و باوکان ئەوەندە بەتەنگ ئەوەوەن منداڵەکانیان هاوڕێیەتی ڕەگەزی بەرامبەر نەکات، چاویان کەلا دەبێت لەوەی کە پەیوەندیی سۆزداری لەگەڵ هاوڕەگەزیشدا دروست دەبێت.

ئەو منداڵانەی بەردەوام (ناچار دەکرێن) لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیاندا بن و لە شوێنی نەگونجاودا پێکەوبوونیان بۆ دەڕەخسێت، ئەگەری زۆرە حەز لە یەکتری بکەن.

لەبری ئەوەی سەرپەرشتیاران ببنە ڕێگر لە منداڵەکانیان و بەبێ هۆ کایەی هاوڕێیەتیکردنیان لە قوتابخانە و کۆڵان سنووردار بکەن، باشتر وایە سەرنجیان لەسەر ئەوە بێت پەیوەندییەکان نەخلیسکێن بەرەو زەمینەی سێکسی و نزیکبوونەوەی سۆزدارییان لێ نەکەوێتەوە.

**پەیوەندیی سۆزداری لە نێوان ئەو منداڵانەشدا دروست دەبێت، کە لە هەمان ڕەگەزن.**

هەر ئەوەندەی منداڵ گیرۆدەی پەیوەندییەکی وا بوو، دەبینیت هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و بەزەحمەت هەستەکانی پێ کۆنترۆڵ دەکرێت. هەندێک جار خوو دەداتە کەنارگیری و شەڕانگێزی، هەندێک جاری تریش بە زۆر گوێگرتن لە موزیک و گۆڕینی تەرزی پۆشینیەوە دەیگرێت.

تەنانەت لەو جۆرە حاڵەتانەشدا، نابێت دایکان و باوکان سەریان لێ بێتەوە یەک و بە تووڕەیی و گرژییەوە لەگەڵیدا بجووڵێنەوە.

**تەنانەت لەو جۆرە حاڵەتانەشدا، نابێت دایکان و باوکان سەریان لێ بێتەوە یەک و بە تووڕەیی و گرژییەوە لەگەڵیدا بجووڵێنەوە.**

دایک و باوکی هۆشیار هێندە ئەزموونیان هەیە، درکی ئەوە بکەن کە ڕۆڵەکەیان -لە هەموو کات زیاتر- پێویستی بە پشتگیری و دڵنەوایی ئەوانە، دەشزانن منداڵەکەیان گیری خواردووە بەدەست ئاراستەکردنی هەستەکانیەوە، بۆیە بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵدەستن و وەک دوو ڕێنیشاندەری دڵسۆز بە دانایی و کارزانیی خۆیان ڕێگەی منداڵەکەیان ڕۆشن دەکەنەوە.

**هەندێك جار منداڵان لە ناو خۆیاندا ئەندامی مەحرەمیان پیشانی یەکتر دەدەن، باشە چی بکەین لەو حاڵەتانەدا؟**

یەکێک لەو ڕەفتارە بەربڵاوانەی کە لە منداڵانی خوار تەمەن ٧ ساڵ بەتایبەت کوڕاندا دەبینرێت، ئەوەیە ئەندامی مەحرەمیان نیشانی یەکتر دەدەن یان حەز دەکەن ئەندامی مەحرەمی منداڵێکی تر ببینن.

با دایکان و باوکان نەشڵەژێن و خۆیان نەخەنە دڵەڕاوکەوە، باشترین شت ئەوەیە سەرنج بخەنە سەر ڕێگەچارەی حاڵەتەکە.

سەرەتا دەبێت لە ڕێگەی (زمانی کردارەوە) پەیوەندیی لەگەڵدا ببەستین و بۆی ڕوون بکەینەوە کە لەشولاری مرۆڤ تایبەتە بە خۆی و دەرخستنی ئەندامی مەحرەم بۆ کەسانی تر "کارێکی باش نییە"، چونکە ئەگەر بزانێت ئاماژەی سێکسی لەخۆ گرتووە، جارێکی تر دووبارەی ناکاتەوە. لەسەرخۆیی گەورەکان و هۆشیارکردنەوەی منداڵان، زامنی تێپەڕاندنی ئەو هەڵسوکەوتەیە کە منداڵان بۆ خۆشی و ڕابواردن دەستیان داوەتێ.

> **هەر ئەوەندەی منداڵان ئەندامەکانی خۆیان نیشانی یەکتری دا، ئیتر نابێت وا بزانین مەبەستیان سێکسە.**

هەندێك لە گەورەکان دەیانەوێت بە چاوسووکردنەوە و سزادان ڕێ لەو هەڵسوکەوتە بگرن، لە کاتێکدا ئێمە دەزانین ترساندن و سزادان هیچ کاتێک نەبووەتە هۆی چارەسەری کێشەکان. ئەم جارە منداڵەکە لە ترسی ئەوەی زیانی پێ نەگات، دەچێت بەدزییەوە دەیکات.

دەرنەخستن و پاراستنی جەستە، پارچەیەکە لە پارچەکانی گەشەی منداڵانی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی. لەبەر ئەوە ئەو منداڵانەی پەروەردەی مەحرەمیەتیان وەرگرتووە، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەیان تێدا بەدی ناکرێت.

ئەگەر منداڵێک پاش تەواوکردنی قۆناغی سەرەتاییش هێشتا فێری ئەوە نەبووبوو تایبەتمەندییە کەسییەکانی خۆی بپارێزێت، مانای وایە کەموکورتییەک لە پەروەردەی مەحرەمیەتەکەیدا هەیە.

> **ئەگەر منداڵێک پاش تەواوکردنی قۆناغی سەرەتاییش هێشتا فێری ئەوە نەبووبوو تایبەتمەندییە کەسییەکانی خۆی بپارێزێت، مانای وایە کەموکورتییەک لە پەروەردەی مەحرەمیەتەکەیدا هەیە.**

پێویستە بەوپەڕی (جددیەتەوە) قسەی لەگەڵدا بکەین و پێی بڵێین کە ئەوە ڕەفتارێکی هەڵەیە. دەبێت لە جددیەتی دایک و باوکییەوە تێبگات کە ڕەفتارەکەی هەڵەیە. مەبەستمان لە جددیەت، تووڕەبوون و قیڕاندن بەسەریدا نییە ، بەڵکو بریتییە لە دەربڕینی ڕاشکاوانەی کە "ئەوە ڕەفتارێکی هەڵەیە و نابێت بکرێت"، تەنانەت دەتوانین بەڵێنیان لێ وەربگرین.

منداڵی واش هەیە گەیشتووەتە قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، کەچی دەبینیت ئەندامی مەحرەمی خۆی نیشانی کەسانی تر دەدات و وێنەی جەستەی دەنێرێت بۆ ئەو کەسانەی بە هاوڕێی خۆییان دەزانێت. ئەو جۆرە حاڵەتانە پێویستیان بە هاوکاریی کەسانی پسپۆڕ هەیە، تاکو سەرچاوەی ئەو لادانە بدۆزنەوە و هەوڵی چارەکردنی بدەن.

> **بوونی ئەم حاڵەتە لە منداڵانی قۆناغی ناوەندی و ئامادەییدا، داخوازی ئەوەیە بەدوای سەرچاوەکەیدا بگەڕێین و بەزووترین کات چارەسەری بۆ بدۆزینەوە.**

بە شێوەیەکی گشتی ئەم ڕەفتارە لەو منداڵانەدا دەبینرێت کە ڕووبەڕووی فەرامۆشکاری بوونەتەوە و پەیوەندییە

خێزانییەکانیان لاوازە، لەگەڵ ئەو منداڵانەی توندوتیژییان بەرامبەر نوێنراوە.

ئەو منداڵانەی لە خێزانەکانیاندا پشتگوێ خراون و لەڕووی عاتیفییەوە فەرامۆش کراون، دەچن هاوڕێیەتیی جۆراوجۆر دەبەستن، یان هەوڵ دەدەن هاوڕێیەتییەکانیان بگۆڕن بۆ پەیوەندیی عاتیفیی نزیکتر، تاکو لەو ڕێگەیەوە ئاتاجیی ناخیان بۆ خۆشەویستی پڕ بکەنەوە.

## هەڵوێستمان چۆن بێت بەرامبەر ئەو منداڵەی یاری بە ئەندامی زاووزێی دەکات؟

لە هەموو تەمەنێکدا منداڵان پەرۆشی ئەندامەکانی جەستەی خۆیانن و هەوڵ دەدەن کەشفی بکەن، ئەوەش تا بڵێی هەڵسوکەوتێکی مرۆڤانەیە.

چ کوڕان، چ کچان، جاروبار حەزیان لێیە ئەندامی زاووزێی خۆیان بناسن و یاری پێ بکەن، ئەوە لە هەمان کاتدا مافی خۆیانە بۆ ناسین و کەشفکردنی لەشولاری خۆیان.

لە کاتی تێبینیکردنی حاڵەتێکی لەو جۆرە، نابێت دایکان و باوکان بە هیچ شێوەیەک وشەگەلێکی هاوشێوەی (پیسە، گوناحە، بێئەدەبییە) بەکار بهێنن، چونکە ئەو وشانە دەبنە هۆی ئەوەی منداڵەکە بێز لە جەستەی خۆی بکاتەوە.

کاریگەریی نەرێنیی ئەو مامەڵە هەڵەیە تاکو گەورەییش درێژ دەبێتەوە، هەندێ حاڵەتی تێکچوونی فرمانی سێکسی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆکارە.

> سروشتیترین مافی منداڵ ئەوەیە، جەستەی خۆی بناسێت.

ئەگەر حاڵەتەکە نەبووبوو بە خوو، چاکتر وایە خۆمانی لێ غافڵ بکەین. خۆ ئەگەر هاتوو منداڵەکە بەردەوام دەستی لە دەرپێکەیدا بوو، ئەوکات دەبێت بیر لەوەش بکەینەوە کە لەوانەیە تووشی خوران یان

هەستیاریی پێست هاتبێت و گرفتێکی پزیشکیی هەبێت.

جاری وایش هەیە ئەم حاڵەتە لەو منداڵانەدا دەبینرێت کە پەروەردەی تەوالێتیان بە شێوەیەکی تەندروست بەڕێوە نەچووە، دەبینیت زۆربەی کات دەستیان بە ئەندامی زاووزێیانەوەیە. لە سەروبەندی پەروەردەی تەوالێتدا، زووزوو ئاگادار دەکرێتەوە کە: "بیگرە، باش بیگرە، نەکەی بیکەی بەخۆتا!"، ئیتر ئەویش وا دەزانێت مەبەست لە (گرتن) ئەوەیە ئەندامی زاووزێی بگرێت. دەمەوێت ئەوە بڵێم، کە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو ڕەفتارەی لەو سەردەمەوە بۆ مابێتەوە.

> **نابێت دایکان و باوکان بە هیچ شێوەیەک وشەگەلێکی هاوشێوەی، (پیسە، گوناحە، بێئەدەبییە) بەکار بهێنن، چونکە ئەو وشانە دەبنە هۆی ئەوەی منداڵەکە بێز لە جەستەی خۆی بکاتەوە.**

جاری وایش هەیە لە کاتی تەنگەتاویدا دەست بۆ ئەو ئەندامەی دەبات، لەبەر ئەوە نابێت خێراخەیاڵمان بە لای (دەستپەڕی منداڵان)دا بچێت.

دیارترین نیشانەی دەستپەڕی منداڵ ئەوەیە، بە شێوەیەکی بەردەوام خۆی لە شتێک بخشێنێت و ئارەقەی سوور و شین دەربکات.

**ئایا چاوپۆشی بکەین لە منداڵەکانمان، ئەگەر بۆمان دەرکەوت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە زانیاریی سێکسی بەدەست دەهێنن؟**

نەخێر.

بەشێک لە دایکان و باوکان شەرم دەکەن لەوەی خۆیان پێداویستیی منداڵەکانیان بۆ پەروەردەی سێکسی پڕ بکەنەوە و نازانن چۆن بۆیان باس

بکەن، لەبەر ئەوە ئینتەرنێت بە ڕێگەچارەیەکی لەبار دەزانن بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە.

وەک خۆیشتان دەزانن لە ئینتەرنێتدا هیچ بەند و سنوورێک نییە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، زانیاریی دروستی سێکسی ئەوە هەر زۆر بەزەحمەت دەست دەکەوێت. خۆ ئەگەر ئەو کەسە منداڵ بێت، کارەکە ئەوەندەی تر قووڵ دەبێتەوە. لە بەرامبەر هەر گەڕانێکدا، ئەگەری ئەوە هەیە چەندین فیلم و دیمەنی سێکسی بەڕوویدا بکرێنەوە. با بڵێین ئەگەر زانیاریی ڕاست و دروستیشی دەست بکەوێت، هێشتا بۆ ئەو ناگونجێت، چونکە نازانین بۆ چ ئاستێک نووسراوە و منداڵەکە بە چ شێوەیەک لێی تێدەگات.

ئەگەر منداڵ دەستی برد بۆ ئەندامی زاووزێی، نابێت خێرا خەیاڵمان بچێت بە لای دەستپەڕدا.

گەشەی سێکسیی منداڵ، شتێک نییە لە ڕۆژێکدا یان مانگێکدا تەواو بێت. پرۆسەیەکە کە چەندین مانگ، بگرە جاری وایە چەند ساڵێک دەخایەنێت. ئەو پەروەردە سێکسییەی لە چوارچێوەی پەروەردەی مەحرەمیەتدا پێشکەش ناکرێت، کاریگەریی خراپی دەبێت لە سەر تەندروستیی ڕۆحیی منداڵ.

ئینتەرنێت ژینگەیەکی ئەوەندە متمانەپێکراو نییە بەبێ لەبەرچاوگرتنی پێگەیشتنی عاتیفی و گەشەی زیهنی، منداڵەکەتی پێ بسپێردرێت.

گەشەی سێکسیی تەندروست لە ڕێگەی گفتوگۆی دوولایەنەی نێوان گەورە و منداڵەوە دەبێت، نەوەک لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە.

## چۆن لەگەڵ منداڵێکدا بجووڵێینەوە، کە لە ڕێگەی تەلەفۆن و ئینتەرنێتەوە ئاڵوگۆڕی شتی سێکسی دەکات لەگەڵ هاوڕێکانیدا؟

کورتەنامە بەربڵاوترین ئامرازی پەیوەندییە، کە بووەتە هۆکاری لادانی ڕەوشتی لەنێو منداڵاندا. ئەو باسوخواسانەی ڕووبەڕوو ڕووی نایەت بیاندرکێنێت، زۆر بەئاسانی لە نامەدا دەریاندەبڕێت، هاوکات بۆ ئاڵوگۆڕی فیلم و نوکتە و ئەو شتانەش بەکاری دەهێنن.

> **لەبری ئاڵوگۆڕکردنی نامە، چاکتر وایە ڕێنمایی منداڵەکانمان بکەین بە تەلەفۆن قسە بکەن.**

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پەیوەندیی نووسراو تەنیا لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە ئەنجام نادرێت، ئێستا وەتس ئەپ، تانگۆ، ماسنجەر و فەیسبوک و ئینستاگرامیش هاتوونەتە ڕیزەوە.

هەر لەبەر ئەمەیە کڕینی مۆبایلی زیرەک بۆ منداڵێک کە هێشتا توانای ئاڕاستەکردنی هەستەکانی نییە و بەتەواوەتی درکی هەڵەکانی ناکات، گیرۆدەکردنی ئەوە بە شتێکەوە کە بەزەحمەت لە ژێر باری دەردێت. کەی گەیشتە کۆتا قۆناغی ناوەندی، ئەوکات ئاساییە تەلەفۆنی خۆی هەبێت. کڕینی مۆبایلی زیرەکیش دەبێت بخرێتە کۆتایی قۆناغی هەرزەکارییەوە.

> **دەستەوسانی و نەپارێزراویی منداڵەکانمان لە ئاست شاڵاوی دیمەنە نەشیاوەکاندا، بە ئەندازەی بێسنووریی ئەو هێڵەیە کە بەکاری دەهێنن.**

لێرەدا گرفتەکە ئەوە نییە متمانە بە منداڵەکەت ناکەیت، مەسەلەکە ئەوەیە ئایا هێڵی تەلەفۆنی هەیە یان نا، چونکە چەندێک بەجوانییش گۆشت کردبێت،

دوا جار ئەگەر تەلەفۆنی هەبێت، لەلایەن کەسانی ترەوە؛ جا برادەرەکەی قوتابخانەی بێت یان هاوڕێکەی کۆڵان، ئەگەری زۆرە نامەی نەشیاوی بۆ بێت. لە ئەگەری بەدیکردنی حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا، نابێت خۆمان تووڕە بکەین و بکەوینە هەڕەشەکردن، بەڵکو دروست ئەوەیە جارێکی تر چاو بخشێنینەوە بە چۆنێتیی بەکارهێنانی مۆبایلدا. دەستەوسانی و نەپارێزراویی منداڵەکانمان لە ئاست ئەو شتانەدا، بە ئەندازەی بێسنووریی ئەو هێڵەیە کە بەکاری دەهێنن.

> **پەیوەندیی تەلەفۆنی یان دیداری ڕووبەڕوو، دەکرێت ببێتە جێگرەوەی کورتەنامە.**

دەبێت بە زمانی کردار ئەوەی تێبگەیەنین کە تەماشاکردنی ئەو چەشنە دیمەنانە، پێش هەموو شتێک زیان بە سەنگینی و ڕێزداریی کەسەکە خۆی دەگەیەنێت. خۆ ئەگەر نەیدەتوانی بەر بە نامەی هاوڕێکانی بگرێت، ئەوکات دەتوانین بە لێکتێگەیشتن، بەکارهێنانی ئینتەرنێت ڕابگرین، بەو شێوەیە دەشتوانێت خۆی لە سەر قسەکردن بە تەلەفۆن ڕابهێنێت.

## چۆن مامەڵە بکەین، ئەگەر بۆمان دەرکەوت منداڵەکەمان خووی گرتووە بە سەیرکردنی فیلمی سێکسییەوە؟

لای هەمووان ئاشکرایە کە زۆرێک لە فیلم و کەرەستە بینراوە سێکسییەکان لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە بڵاو دەکرێنەوە، ئەوە دایکان و باوکانن کە پێویستە شێوازی بەکارهێنانی ئینتەرنێت فێری ڕۆڵەکانیان بکەن. کاتێکیش بەم ئەرکەی سەرشانیان هەڵناستن، خۆیان لە بەرامبەر زنجیرەیەک لە گرفت و کێشەی خێزانیدا دەبیننەوە کە هیچ دوور نییە سەر بکێشێت بۆ هەڵوەشانەوەی سەرلەبەری خێزان.

کاتێک لە دیدگایەکی دەروونناسییەوە تەماشای مەسەلەکە دەکەین، دەبینین سەرقاڵبوونی منداڵ بە بابەتی سێکسییەوە ئەوەندەی پەیوەستە بە جۆری ئەو پەیوەندییەی لە نێوانی ئەندامانی خێزانەکەیدایە، ئەوەندە پەیوەست نییە بە خودی منداڵەکەوە.

**خووگرتن بە فیلم و وێنەی نەشیاوەوە، زۆر جار لە بکەری کارەکەوە -کە منداڵەکەیە- سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پەیوەندییەکی دروستی خێزانی لە خێزانەکەیدا نییە.**

یەکەم هەنگاوی چارەسەر بۆ ئەو منداڵانەی ئالوودەی فیلم و بابەتی سێکسین، بریتییە لە بەهێزکردن و توندوتۆڵکردنەوەی پەیوەندییە خێزانییەکانیان، هەروەها بەرزکردنەوەی جۆری وابەستەیی نێوان دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکەیان. هاوکات پێویستە کار لە سەر زیادکردنی کاریگەریی دایک و باوک بکرێت لە سەر منداڵ. هەروەها دەبێت ئەوەشی بۆ ڕوون بکرێتەوە کە تەماشاکردنی ئەو جۆرە دیمەنانە، کاریگەریی خراپی دەبێت لە سەر ڕۆح و مێشکی. بەڵام بۆ ئەوەی قسەکان کاریگەریان هەبێت، ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکات، پێویستە وابەستەییەکی تۆکمەی هەبێت لەگەڵ منداڵەکەدا.

بەڵام ئەگەر منداڵەکە لە قۆناغی هەرزەکاریدا بوو و مەبەستیشی لە سەیرکردنی ئەو شتانە بەدەستهێنانی حەزی سێکسی بوو، ئەوکات پێویستە هەنگاوبەهەنگاو مامەڵە لەگەڵ حاڵەتەکەدا بکرێت، تاکو بەیەکجارەکی وازی لێ بهێنێت.

ئەگەر منداڵەکە هەموو ڕۆژێک پێویستی بەو کارە بوو، ئەوا بەرنامەیەکی یەک هەفتەیی بۆ ئامادە دەکەین، دەتوانین کۆمەڵێک چالاکیی وەک؛ گەڕان، وەرزش و هونەر بخەینە ناو بەرنامەکەمانەوە. چەندە سەرقاڵی بەسەربردنی

کاتێکی خۆش بێت لەگەڵ چالاکییەکاندا، ئەوەندە هەست و بیری زیندە دەبێتەوە و خەیاڵی لای ئەو شتانە نامێنێت.

ئەو منداڵانەی ئەو جۆرە خووەیان هەیە، پێویستە لە نامە و نامەکاری و ژینگەی ئینتەرنێت دوور بخرێنەوە و نەهێڵین بەتەنیا بمێننەوە. پەیوەندیی بەردەوام (ئاخاوتن و ئاڵوگۆڕی عاتیفی و دەربڕینی هەستەکان)، شێوازێکی زۆر کاریگەرە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئالوودەبوون.

> **پەیوەندیی بەردەوام (ئاخاوتن و ئاڵوگۆڕی عاتیفی و دەربڕینی هەستەکان)، شێوازێکی زۆر کاریگەرە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئالوودەبوون.**

وەک ڕێوشوێنێکی زیادە، دەتوانین سوود لەو پاکێجانە وەربگرین کە تایبەتن بە خێزان. بە مەبەستی ئاگاداربوونەوەش لە ماوە و قووڵی (چەندێتی و چۆنێتی)ی هەڵسوکەوتی منداڵەکەمان، دەتوانین سوود لە یادگەی پێگەکان (history) وەربگرین و بەپێی ئەوە دەستی یارمەتی بۆ جگەرگۆشەکانمان درێژ بکەین.

ئەگەر خۆیشمان سەرکەوتوو نەبووین، وەک هەمیشە دەتوانین سوود لە ئەزموون و پسپۆڕیی کەسانی تایبەتمەندیی بوارەکە وەربگرین.

## چی بکەین بۆ کەمکردنەوەی زیانی ئەو زانیارییە سێکسییانەی کە منداڵ پێشوەختە دەستی کەوتووە؟

سڕینەوە و لەبیربردنەوەی ئەو زانیارییانە مەحاڵە، کە چوونەتە مێشکەوە. ئەو زانیارییە سێکسییانەی کە منداڵ پێش قۆناغی هەرزەکاری دەستی دەکەوێت، لە هەندێکدا لە سەر شێوەی سەرسامی ڕەنگ دەداتەوە، لە هەندێکی تریشدا بە شێوەی بێزلێکردنەوە، جاری وایش هەیە دەبێتە هۆکاری ئەوەی لە دایک و باوکی دوور بکەوێتەوە یان بە چاوێکی ترەوە تەماشای گەورەکان بکات.

چەندە بە هەڵە لە جنس تێگەیشتبێت، ئەوەندە ڕوانینی بۆ گەورەکان دەگۆڕێت.

لەو جۆرە حاڵەتانەدا دانیشتنی تایبەت و دەربڕینی ئەوەی کە: "لە ڕاستیدا ئەوە شتێکی ئاساییە"، نەک هەر نابێتە هۆی کەمکردنەوەی زیانەکە، بگرە لەوانەیە زیادیشی بکات.

> **لەو جۆرە حاڵەتانەدا دانیشتنی تایبەت و دەربڕینی ئەوەی کە: "لە ڕاستیدا ئەوە شتێکی ئاساییە"، نەک هەر نابێتە هۆی کەمکردنەوەی زیانەکە، بگرە لەوانەیە زیادیشی بکات.**

هەڵە تێگەیشتنەکەی، بە تێپەڕبوونی کات و چوونە ناو قۆناغی هەرزەکارییەوە ڕاست دەبێتەوە.

دایک و باوک نابێت ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ منداڵەکانیاندا بگۆڕن، با پێشیان بزانن کە فێری شتی سێکسیی سەروو تەمەنی خۆیشیان بوون، لەبەر ئەوە دروست نییە زۆر بە دەوروخولیدا بێن و بایەخێکی وای پێ بدەن لە جاران زیاتر بێت. بە کورتی؛ وازی لێ بهێنن.

درێژەدان بە ڕۆتینی ژیانی ڕۆژانە، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کاردانەوەکانی ناو ناخی منداڵ. بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان لە ژێر کاریگەریی ئەو شتانە دێتە دەرەوە، کە یەکەم جار بە بیستنیان تووشی سەرسامی هاتبوو. هەرچۆنێک بێت حاڵەتەکە قبوڵ دەکات، با تەواو چاکیش نەبێتەوە.

**پێویستە ئاگامان لەوە بێت لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکەین لە سەر ئەوەی چیی بیستووە و چیی بینیوە، یان بچین بەرۆکی بگرین و بەزۆر ئامۆژگاریی بکەین.**

بەڵام هاتنەوە سەرخۆی تەواوەتی و تێگەیشتن لەوەی کە سێکسیش پارچەیەکی سروشتیی ژیانە، لەگەڵ تەمەنی هەرزەکاریدا تێپەڕ دەبێت. هەر ئەوەندەی منداڵ لە هەستەکانی خۆیدا هەستی بە سەرەتاکانی ڕەمەکیی جنس جەستەیی کرد و بۆی دەرکەوت کە شتێکی ئاساییە و لە هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە، ئیدی پەشۆکانە دەروونییەکەی دەڕەوێتەوە و لەگەڵ دایک و باوکیدا دەچێتەوە سەر پەیوەندییەکەی جارانی.

هەواگۆڕین و چوون بۆ گەشتوگوزار و سەرقاڵبوون بە کاروباری ڕۆژانەشەوە، چارەسەرێکی باشە بۆ ئەو منداڵانەی کە لە تەمەنێکی زووەوە ئاشنایەتییان پەیدا کردووە لەگەڵ بابەتە سێکسییەکاندا. بۆ نموونە؛ سەردانکردنی شاری یاری و بەشداریکردن لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، لە وێنەی ئاهەنگ و فێستڤاڵی هونەری، بۆ ئەو جۆرە منداڵانە زۆر باشە. چەندە هەست بەوە بکات کە ژیان لە سەر ڕیتمی سروشتیی خۆی بەردەوامە، ئەوەندە لە ژێر کاریگەریی ئەو

**دایک و باوک نابێت ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ منداڵەکانیان بگۆڕن، با پێشیان بزانن کە فێری شتی سێکسیی سەروو تەمەنی خۆیشیان بوون.**

شتانە دەردەچێت کە فێریان بووە.

پێویستە ئاگامان لەوە بێت لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکەین لە سەر ئەوەی چیی بیستووە و چیی بینیوە، یان بچین بەرۆکی بگرین و بەزۆر ئامۆژگاریی بکەین. ڕاسترین چارەسەر ئەوەیە، سەری بابەتەکە هەڵنەدەینەوە و وازی لێ بهێنین بۆ ڕۆژگار.

## ئەگەر منداڵەکەمان پرسیاری کرد: "بۆچی دەبێت دایک و باوك پێکەوە بخەون و منداڵیش بەجیا؟"، چۆن وەڵامی بدەینەوە؟

**"که منداڵ هەستی کرد کەنارخراوە و نازی نادرێتێ، ئیتر بۆخۆی دەکەوێتە بیانوگرتن لەوەی بۆچی دایک و باوکی پێکەوە دەخەون."**

بە شێوەیەکی گشتی لە ژێر ئەم پرسیارەدا هەستی کەنارخران خۆی حەشار داوە.

کاتێك منداڵ خۆی بە جودا بینی لە دایک و باوکی، دەکەوێتە پرسیارکردن سەبارەت بە هۆکاری ئەو جوداییە: "بۆچی من لە جێگەیەکی تردا دەخەوم؟"

ئەگەر وابەستەیی دڵنیاییبەخشی نێوان باوان و منداڵ بەردەوام بێت، منداڵ ئەو هەستەی لە لا دروست نابێت.

جارجارەش هەر (بەڕاستی) ئەو پەرۆشییەیان بۆ دروست دەبێت و دەپرسن: "بۆچی تۆ لەگەڵ باوکم/دایکم دەخەویت؟"، ئەم جۆرە پرسیارانە پەیوەندییان نییە بە سەر هەستی کەنارخراوی و بێنازییەوە.

ڕەنگە وەڵامێکی لەم جۆرە لە جێگەی خۆیدا بێت: "چونکە دایە گیانتم/بابە گیانتم زۆر خۆش دەوێت." لە بەرامبەر ئەو وەڵامەدا، ئەو منداڵەی خۆی بە بەشێک لە دایک و باوکی دەزانێت، نایەت بپرسێت:

"کەواتە منت خۆش ناوێت."، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە باکگراوندی عاتیفیی پرسیارەکەی پەیوەست نییە بە خودی خۆیەوە، بەڵکو دەیەوێت بزانێت لەبەر چی پێکەوە دەخەون. منداڵان بەگشتی بەم جۆرە وەڵامە زۆر دڵخۆش دەبن: "لەبەرئەوەی دایکتم/باوکتم زۆر خۆش دەوێت."

بەڵام ئەگەر منداڵەکە خۆیشی خستە ناو مەسەلەکەوە و پرسیارەکەی بەم شێوەیە کرد: "بۆچی لەگەڵ من ناخەویت، کەچی دەچیت لەگەڵ دایکم/باوکم دەخەویت؟"، ئیدی ئەوکات وەڵامی ئێمەش جیاواز دەبێت.

> **ڕەنگە وەڵامێکی لەم جۆرە لە جێگەی خۆیدا بێت: "چونکە دایە گیانتم/بابە گیانتم زۆر خۆش دەوێت.**

هەمان وەڵامی پێشوو: "لەبەر ئەوەی دایکتم/باوکتم زۆر خۆش دەوێت"، دەبێتە هۆی ئەوەی وا هەست بکات کە ئەومان خۆش ناوێت.

لەم بارەدا پێویستە دایک یان باوک یەکێکیان هەستن بە چارەکردنی ئەو هەستی کەنارخراوەییەی کە لە دەروونی منداڵەکەدا دروست بووە، ئەویش بەم شێوەیە: "ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ تۆدا بخەوم؟"، ئەگەر منداڵ بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، لەو بارەدا پێویستە دایک یان باوک یەکێکیان بە شێوەیەکی کاتی بچنە ژووری تایبەتیی منداڵەکە و تا منداڵەکەیان خەوی لێ دەکەوێت لای بمێننەوە.

> **پێویست ناکات وەڵامی قووڵ و فەلسەفیی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەینەوە.**

پێویست ناکات وەڵامی قووڵ و فەلسەفیی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەینەوە. منداڵ لە نێوەندی ڕیتمی ڕۆژانەی ژیاندا، خۆی فێر دەبێت کە دەبێت بەو شێوەیە بێت.

## ئەگەر منداڵ ڕۆشنبیرییەکی سێکسی ناتەندروستی هەبێت، ئایا دەتوانین بۆی ڕاست بکەینەوە؟

بەڵێ.

ئەو پەروەردە سێکسییەی لە قوتابخانە و شوێنە گشتییەکاندا بەکۆمەڵ پێشکەش دەکرێت، بە شێوەی جیاجیا کار لە منداڵان دەکات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە هەموویان لە یەک ئاستی عاتیفی و زیهنیدا نین، با هاوتەمەنیش بن. ئەو شتەی هەندێکیان بەدروستی لێی تێگەیشتوون، دەبینیت ئەوانی تر سەروبن لێی تێگەیشتوون. هەر لەبەر ئەوەیە دەڵێین پەروەردەی سێکسی بەکۆمەڵ نابێت، بەڵکو کاری تاکەکەسییە.

لە حاڵێکدا ئەگەر هاتوو منداڵ زانیارییە سێکسییە چەوتەکانی خۆی لای دایک و باوکی باس کرد، دەبێت بە ڕەچاوکردنی تەمەن و ئاستی تێگەیشتنی بۆی ڕاست بکەنەوە: "لە ڕاستیدا ڕەنگە مامۆستاکەتان مەبەستی ئەوە بووبێت کە..."

لە حاڵەتی تێبینیکردنی هەڵسوکەوتی نامۆدا بۆ نموونە؛ درەنگ هاتنەدەرەوە لە تەوالێت و حەمام، زوو چوونە سەر جێگە، بەخەبەربوون تا درەنگانی شەو، پێویستە چەند گۆڕانکارییەک دروست بکەین و کەشێکی وا دروست بکەین منداڵەکە خۆی لەبیر بچێتەوە. چوون بۆ گەشت و سەیران، ئەنجامدانی چالاکیی وەرزشی و بەشداریکردن لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە نموونەی ئەو ڕێوشوێنانەن کە دەتوانین بیانگرینە بەر.

> **ئەو زانیارییە سێکسییانەی کە منداڵ بە هەڵە لێیان تێگەیشتووە، پێویستە بۆی ڕاست بکرێتەوە.**

## چی بکەین ئەگەر زانیمان منداڵەکەمان پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ کەسێکی تردا هەیە؟

منداڵ هەرچییەک بکات، دایک و باوک بۆیان نییە دەستبەرداری بن، دەریبکەن یان حاشای لێ بکەن.

هەموو جۆرە کێشەیەکی منداڵ، ئەرکێکی تازەیە بۆ دایک و باوک تاکو بەبێ تووڕەبوون و زیانگەیاندن بە منداڵەکەیان، چارەسەرێکی گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.

**هەموو جۆرە کێشەیەکی منداڵ، ئەرکێکی تازەیە بۆ دایک و باوک تاکو بەبێ تووڕەبوون و زیانگەیاندن بە منداڵەکەیان، چارەسەرێکی گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.**

دەستەوسانترین حاڵەتی دایک و باوک ئەو کاتەیە، کە دەزانن منداڵەکەیان پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ کەسێکی تردا هەیە.

حاڵەتەکە چەندە بە لای دایک و باوکەوە سەختیش بێت و توانای قبوڵکردنیشیان نەبێت، بەڵام دوا جار چارەسەر هەر دەبێت لە ڕێگەی ئەوانەوە بێت. هیچ کەس مافی ئەوە نییە واز لە منداڵ بهێنێت، یان ڕەتی بکاتەوە و بێدەرەتانی بکات.

ئەو هەڵانەی مرۆڤ دەیانکات، جاری وایە کێشمەکێش و ململانێی وەها لە ناخیدا هەڵدەگیرسێنن، وا لەو مرۆڤە دەکەن سەرلەنوێ بەخۆیدا بچێتەوە و هەستێتەوە سەر پێ. جا بۆیە لەم سۆنگەیەوە دەڵێین، ئەو منداڵەی

**ئەو هەڵانەی مرۆڤ دەیانکات، جاری وایە کێشمەکێش و ململانێی وەها لە ناخیدا هەڵدەگیرسێنن، وا لەو مرۆڤە دەکەن سەرلەنوێ بەخۆیدا بچێتەوە و هەستێتەوە سەر پێ.**

کەوتووەتە هەڵەیەکی لەو جۆرەوە، ئەگەر هەستی بە هەڵەکەی خۆی کردبێت و ململانێیەکی ناوەکی لە ناخیدا دروست بوویێت، مانای وایە کاتی ئەوە هاتووە ڕێگەی بۆ خۆش بکرێت گوێ لە ویژدانی بگرێت و لەگەڵ پەشیمانییەکەیدا بژی، نەک ئەوەی حاشای لێ بکرێت و هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵدا بپچڕێنرێت. ئیدی ئەودەم لە سایەی پاڵپشتیی خێزانەکەی و هێزی پەشیمانییەکەیدا، دەتوانێت هەستێتەوە سەر پێ و دووبارە دەست بکاتەوە ملی ژیان.

بەپێچەوانەوە، سزادان و سووکایەتیپێکردن و سەیرکردنی بە چاوی گوناهکارەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکە وا هەست بکات باجی کارەکەی داوە و هیچی لە سەر نەماوە، ئیتر چۆن ئەو منداڵە هەست بە پەشیمانی دەکات!.

**سزادان و سووکایەتیپێکردن و سەیرکردنی بە چاوی گوناهکارەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکە وا هەست بکات باجی کارەکەی داوە و هیچی لەسەر نەماوە، ئیتر چۆن ئەو منداڵە هەست بە پەشیمانی دەکات!.**

خۆ ئەگەر منداڵ بە ڕێژەیەکی بەرچاو و بێ هەستکردن بە پەشیمانی، وەها هەڵسوکەوتێکی دەنواند، بگرە پاساویشی دەهێنایەوە و بەرگریی لە خۆی دەکرد، ئەوکات دەبێت بیرمان بۆ لای ئەوە بچێت کە لەوانەیە لە بناغە ئەخلاقییەکانیدا یاخود لە سەرچاوەی هەڵچوونە سێکسییەکانیدا کێشەیەک هەبێت. چارەسەربوونی ئەو جۆرە حاڵەتانەش، بەبێ هاوکاریی کەسانی پسپۆڕ ئەستەمە.

## ڕاتـان چـۆنه سـەبارەت بە پێکەوەمـانەوەی منداڵان لە بەشەناوخۆیی و شوێنە گشتییەکاندا؟

پێکەوە مانەوەی بەکۆمەڵی منداڵان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، لە قۆناغی ئامادەییەوە دەست پێ دەکات، ئەویش بە مەرجی ڕەچاوکردنی ڕێساکانی مەحرەمیەت. دەکرێت ئەو جۆرە ئەزموونانە ببنە مایەی بەهێزکردنی کەسێتیی منداڵ، ئەگەر هاتوو مەرجەکانی سەرەوە هاتنە دی.

پەروەردەی مەحـرەمیەت داخـوازی ئەوەیە لەو شـوێنانەدا کە منـداڵان پێکەوە دەمێننەوە، ڕەچاوی سنووره فیزیکییەکان بکرێت و بێ مـۆڵەت کەس نەچێتە سنووری ئەوانی ترەوە.

پێویسـتە زانیـاری بـدرێت بەو منـداڵانەی ڕۆشـنبیرییان نییە لەبارەی پەروەردەی مەحـرەمیەت و سـنووره کەسـییەکانەوە، پێویسـتە باسـی جوانی مامەڵەیی و زەریفییان بۆ بکرێت، هەروەها دەبێت داوای ئەوەیان لێ بکرێت لە ژووری نوسـتن و گەرمـاو و تەوالێتەکانـدا ئاگایـان لە جلوبەرگ و هەڵسوکەوتەکانیان بێت و زیادەڕەوی نەکەن.

دەبێت بۆیان ڕوون بکرێتەوە لە کاتی خۆگۆڕیندا ڕێز لە یەکتری بگرن و کەرەستە و جلوبەرگە کەسییەکانیان بەهاوبەشی بەکار نەهێنن.

> **مانەوەی منداڵ لە شوێنێکدا، بەندە بەوەی ئایا ئەو شوێنە ڕەچاوی پەروەردەی مەحرەمیەتی تێدا دەکرێت یان نا.**

لەوە هەڵەتر نییە وا بیر بکەیتەوە کە، "کـوره هەموویان کچن"، یان "هەموویان کوڕن چـی دەبێت"، چونکە لەو جۆره شوێنانەدا منـداڵان حەز لە ڕەگەزەکـانی خۆیشـیان دەکەن. خـۆ ئەگەر مەرجەکـان دەسـتەبەر نەدەبـوون و دڵسۆزی و خەمخۆریی سەرپەرشتیارانیش لە ئاستی پێویستدا نەبـوو، لەبـارترین چارەسـەر

ئەوەیە نەهێڵین منداڵەکانمان لەوجۆرە شوێنانەدا بمێننەوە.

## ئەگەر کوڕ لەگەڵ دایکیدا بخەوێت، ئایا دەبێت بە هاوڕەگەزباز؟

نەخێر، بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە، پێچەوانەی سروشتی مرۆڤانەمانە.

خۆ ئەگەر ئەوە ڕاست بووایە، ئەوا هەموو ئەو منداڵانە هاوڕەگەزباز دەردەچوون کە لەبەر ناچاری لای دایکیاندا دەخەون.

چی لەوە ئاساییترە منداڵێک کە پێویستی بە سۆز و ئەوینی دایکیەتی، لە باوەشی نەرمی دایکیدا بخەوێت، یان ئەو منداڵەی تووشی ترس و دڵەڕاوکە بووە، لە لای دایکی دڵنەوایی بەدەست بهێنێت. ئەوە با لەو لاوە بوەستێت کە هەندێک منداڵی خاوەن پێداویستیی تایبەت هەن، پێویستیان بەوەیە تا ماوەیەکی دیاریکراو لای دایکیان بخەون.

کە منداڵ ئەوەندە ئاتاجی دایکی بێت، ئیتر گوناح نییە بڵێی ئەو منداڵەی لای دایکیەوە دەخەوێت، دەبێت بە هاوڕەگەزباز!.

ئەوپەڕی زیانی خەوتنی درێژماوەی منداڵ لای دایکیدا ئەوەیە، ئەو منداڵە خوو بە دایکیەوە بگرێت.

پێویستە منداڵ لە ماوەی شیرەخۆریدا لای دایکی بخەوێت، لە کۆتایی ئەو ماوەیەدا ئینجا لێی جیابێتەوە. خۆ ئەگەر لەگەڵ کۆتاییهاتنی ئەو ماوەیەدا هەنگاوبەهەنگاو لە دایکی جیا نەبووبێتەوە، ئەوا لە دواییدا بەزەحمەت لێی جیا دەبێتەوە.

> **منداڵ بەوە نابێت بە هاوڕەگەزباز کە لەگەڵ دایکیدا بخەوێت.**

پرۆسەی جیابوونەوەی منداڵ لە دایکی، پێویستە تا (٣٠) مانگی تەواو ببێت.

**ئایا هیچ کێشەیەك لەوەدا هەیە، کوڕان شتی دایك و خوشکیان بەکار بهێنن؟**

نەخێر، کێشە نییە.

کوڕانی خوار تەمەن (٧) ساڵ، پەرۆشییان بۆ جلوبەرگ و کەلوپەلی کچان هەیە و حەز دەکەن یاریی پێ بکەن و بزانن بۆچی بەکار دێن. تاکو پاڵنەری ئەو هەڵسوکەوتەشیان پەرۆشی و حەزی زانین بێت، هیچ کێشەیەک لەئارادا نییە.

**حەزکردنی کوڕان لە کەلوپەلی کچان، بریتییە لە پرۆسەیەک کە بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت:**

**١. حەزی زانین**

کەلوپەل و جلوبەرگی کچان هەمیشە لە هی کوڕان جوانتر و ڕازەوەتر و سەرنجڕاکێشترە، لە هەموو شوێنێکی دونیاشدا هەر بەو جۆرەیە. منداڵ بەسروشت حەزی لە یاریی جوان و ڕازاوەیە. کاتێك کوڕان بۆیان دەردەکەوێت ئەو یاری و شتانە کچانەن، ئیتر جارێکی تر ناچنەوە بە لایدا. مەرجی دروستبوونی ئەو هەستەش ئەوەیە، لە دەوروبەریدا کوڕی تر هەبێت. بۆیە ئەو کوڕەی بەردەوام لەگەڵ کچاندا هەڵدەسێت و دادەنیشێت، زەمینەی ئەوەی بۆ نارەخسێت فێری ئاکاری کوڕانە ببێت، هەر لەبەر ئەوە دەبینیت خەریکی یاریی کچانەیە، ئەگەر پێشی بڵێیت: "کوڕی خۆم ئەوانە یاریی کچانەن، بەمانە یاری بکە کوڕانەن"، کاری تێ ناکات. دەبێت بەردەوام

> **یاریکردنی کوڕان بە شتی کچانە، کاتێک دەبێتە کێشە گەر هەستەکانیان وەکو هەستی کچانی لێهاتبێت.**

بەکردەیی لە ناو کوڕاندا بێت و لەگەڵ ئەوان یاری بکات.

۲. لاسایی کردنەوە

پلەیەک مەترسیدارتر لەوەی سەرەوە، ئەوەیە کوڕێک لە هەڵسوکەوتەکانیشیدا لاسایی کچان بکاتەوە. ئاشکرایە زمانی جەستەی کوڕان لە هی کچان جیاوازترە. کچان دەست و قۆڵەکانیان بە شێوەیەکی تر بەکار دەهێنن و ڕۆیشتن و دانیشتنیشیان جۆرێکی ترە. ئەو کوڕەی هەستان و دانیشتنی لەگەڵ کچاندایە، دوور نییە هەڵسوکەوتەکانی بگۆڕێن و ڕەفتاری وەکو ئەوانی لێبێت. هەوڵ دەدات لاساییان بکاتەوە و وەک ئەوان قسە بکات و وەک ئەوانیش پێبکەنێت و بە ڕێگادا بڕوات. ئەگەر لە کاتی خۆیدا بەم حاڵەتە نەزانرێت و ڕێوشوێنی پێویست نەگیرێتە بەر، ئەوا دەچێتە قۆناغێکی ترەوە، کە ئەویش قۆناغی (وەرگرتنی هەستی کچانە) یە. بۆ بەرگرتن لەو کێشەیە، یەکەم هەنگاو پێویستە ئەو منداڵە کاتی زیاتر لەگەڵ باوکی بەسەر بەرێت و زۆرتر لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکانیدا بمێنێتەوە، هەروەها لەو ژوورە نەمێنێتەوە کە خوشکەکانی تێدا دەمێننەوە و لەبری دایکی، وابەستەیی لەگەڵ باوکیدا دروست بکات.

۳. وەرگرتنی هەستی کچانە

دوای ئەوەی منداڵ خووی گرت بە یاریی کچانەوە و کەوتە لاساییکردنەوەی هەڵسوکەوتیان، ئەگەر ڕێگەچارەی پێویست نەگیرابێتە بەر، ئەوا لە هەنگاوی دواتر منداڵ هەستەکانیشی وەک هەستی کچانی لێدێت. لە هەڵسان و دانیشتنیەوە، لە لەنجەولار و ڕۆیشتنیەوە، لە مامەڵەی لەگەڵ یارییەکانەوە؛ تێدەگەین کە لە ڕووی هەستەکانیەوە ڕەنگی کچانی گرتووە.

لەو جۆرە حاڵەتانەدا، پێویستە ئەو منداڵە لە یاریی کچان دوور بخرێتەوە و لەگەڵ کوڕاندا یاری بکات و کاتێکی زۆرتر لەگەڵ باوک و براکانیدا بەسەر بەرێت.

> **کێشەکە لەوەدا نییە کوڕێک یاریی کچانە بکات، کێشەکە لەوەدایە خۆی وەک کچ ببینێت.**

ئەو منداڵەی سروشتی کچانی گرتووە، نابێت زۆری لێ بکرێت و فشاری بخرێتە سەر. بەوە چاک نابێت پێی بوترێت: "وەک کچ هەڵسوکەوت مەکە"، "یاریی کچانە مەکە"، بگرە لەوانەیە ئەو قسانە خراپتریشی بکات.

**هیچ کێشەیەك دروست دەبێت، ئەگەر کوڕێك لە جێگەیەکدا گەورە بێت کە هەمووی کچە؟**

زۆر ئاساییە ئەگەر کچان لەگەڵ کوڕان، یان کوڕان لەگەڵ کچاندا لە شوێنێکدا پێکەوە بن و بۆخۆیان یاری بکەن، بە مەرجێک بەردەوام دووبارە نەبێتەوە. لەو حاڵەتەدا نەک هەر زیانی نییە، بەڵکو یارمەتیی گەشەکردنیشیان دەدات.

بەڵام دەبێت ئەوەشمان لەبەرچاو بێت، کە مەزاجی هەندێك منداڵ وایە بەزوویی دەچنە ژێر کاریگەریی دەوروبەرەکەیانەوە و برادەرەکانی هەست بە چی بکەن، ئەوانیش هەست بەو شتە دەکەن. بەتایبەت ئەو کوڕانەی لایەنی عاتیفییان باڵادەستە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کچاندا بمێننەوە، ئەگەری ئەوە هەیە بچنە ژێر کاریگەرییانەوە و چاو لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیان بکەن.

بەدەر لەوە، گەشەی سێکسیی منداڵ بەندە بەوەی کە چەندێک هاوڕەگەزەکانی خۆی دەبینێت و دەیانکاتە سەرمەشقی خۆی. کوڕان ئەگەر

پیاوان نەبینن، چۆن دەتوانن ئاکار و تایبەتمەندیی پیاوانە فێر بن، وەک پیاوان بڕۆن بە ڕێگادا و وەک ئەوانیش قسە بکەن. بەڵێ، پاڵنەرە ناوەکییەکان گرنگن، بەڵام بوونی مۆدێل و پێشەنگی دەرەکییش هیچی کەمتر نییە لە فاکتەرە ناوەکییەکان.



**ئەگەر ئیشوکاری باوک وا ڕێک کەوتبوو درەنگ درەنگ بێتەماڵەوە، دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە کوڕی ئەو ماڵە کاتی زیاتر لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا بەسەر بەرێت.**



ئەگەر ئیشوکاری باوک وا ڕێک کەوتبوو درەنگ بێتە ماڵەوە، دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە کوڕی ئەو ماڵە کاتی زیاتر لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا بەسەر بەرێت، هەمان شت بۆ کچانیش ڕاستە.

## چی بکەین، ئەگەر بینیمان کچێك حەز لە کچان دەکات؟

ئەو کچانەی بە شێوەیەکی بەرچاو ڕووبەڕووی توندوتیژی و ترساندن دەبنەوە، لە ڕێگەی نزیکبوونەوە لە هاوڕەگەزەکانی خۆیانەوە، پێداویستیی سۆز و خۆشەویستیی ناو ناخیان پڕ دەکەنەوە. توندوتیژی لە منداڵاندا، دەبێتە هۆکاری ئەوەی هەست بە پێویستیی نزیکبوونەوەی سۆزداری بکەن لە کەسانی تر.

زۆربەی جار ئەو منداڵانەی بۆشایی عاتیفییان هەیە، نازانن چۆن ئەو پێداویستییەیان پڕ بکەنەوە. خۆ ئەگەر ئەو پەیوەندییە دەستلێدان و باوەش پیاکردن و نرخ بۆ دانانیشی لەگەڵدا بێت، ئەوەندەی تر پەیوەستبوون دروست دەبێت. هەرزەکاران بەتایبەتی، توانای بەڕێوەبردنی وابەستەییەکی ئەوەندە بەهێزیان نییە.

بەریەککەوتنی جەستەیی لە نێوان کچاندا کە لە ئەنجامی پێکەوەمانەوە و خەوتنیان لە سەر یەک جێگە سەر هەڵدەدات، هۆکاری وورووژاندنی کۆمەڵە هەستێکە کە ناتوانن لە بەرامبەریاندا خۆیان ڕابگرن.

ئەو شتەی ئەو جۆرە منداڵانە پێویستیانە و بەدوایدا وێڵن، بریتییە لە پەیوەندیی سۆزداری نەک زەبر و سووکایەتی.



**توندوتیژی دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵان بەدوای کەسێکدا بگەڕێن کە سۆز و خۆشەویستییان بداتێ.**



باشترین چارەسەری ئەم حاڵەتە، ئیکسیری خۆشەویستییە.

بۆ بەرگرتنیش لە دروستبوونی ئەو حاڵەتە، دەتوانین هەر لە سەردەمی هەرزەکاریی بەراییەوە ڕێگەیان نەدەین پێکەوە بخەون و دەستبازیی سێکسی جەستەیی بکەن، یان ئاڵوگۆڕی وێنە و گرتەی سێکسی بکەن.

## چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵێکی کوڕدا بکەین، کە حەزی لە نزیکبوونەوەی سۆزدارییە لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا؟

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێم کە هەستکردن بە مەیلی هاوڕەگەزخوازی لە کچاندا تا بڵێی زەحمەتە، بەپێچەوانەوە کوڕان یەکسەر هەستیان پێ دەکرێت ئەگەر هاوڕەگەزخواز بن.

ئەو منداڵەی هەستی هاوڕەگەزخوازی تێدا چەکەرە دەکات، هاوکات لەگەڵ گۆڕانی پێکهاتە ڕۆحییەکەیدا پێکهاتەی جەستەییشی وردەوردە ڕوو لە گۆڕان دەکات. بەدەر لەو لاساییکردنەوەی لە قۆناغی منداڵیدا دەبینرێت، لە قۆناغی هەرزەکاریی بەرایی و هەرزەکاریدا دەست و قۆڵیان هاوشێوەی

کچان دەجوولێنن. هەروەها لەنجەولار دەکەوێتە ڕۆیشتنیان و جوولەی لێویان زیاتر دەردەکەوێت. هەروەها بێزار دەبن لە مووەکانی جەستەیان.

بایەخ دەدەن بە کەرەستەی میکیاژ و برۆیان باریک دەکەنەوە و مووەکانیان لا دەبەن. هاوکات دەست دەکەن بە پۆشینی جلوبەرگی تەسک و بەکارهێنانی جلی ژێرەوەی ئافرەتان و لەپێکردنی گۆرەویی تەنک.

**چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە بە ترساندن و چاوسوورکردنەوە نابێت، بەوە دەبێت هەنگاوبەهەنگاو فێری بکەین چۆن هەستەکانی کۆنترۆڵ بکات.**

ئەو جۆرە کەسانە لەگەڵ پێگەیشتنیاندا دەکەونە بانگەشەی ئەوەی خاوەنی ڕۆحێکی (مێینەن)، کەچی لە ڕاستیشدا بنیاتێکی نێرینەیان هەیە.

هۆکارەکانی ئەم مەیلە سێکسییەی کوڕان، هەمەچەشنە. ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکان ئەوە بێت لە منداڵیدا دەستدرێژیی سێکسیی کرابێتە سەر و بەو هۆیەوە تووشی شڵەژانی ناسنامەی سێکسی بووبێتەوە. جا مەرج نییە ئەو دەستدرێژییە فیزیکی بێت، کاتێک وەک کچ لەگەڵیدا دەجووڵێیتەوە و پێی دەوترێت: "لە جوانیدا دەڵێی کچە"، یان تەماشاکردنی فیلمی سێکسی - بەتایبەتی ئەگەر ناوەرۆکەکەی باسی هاوڕەگەزخوازی بکات- لە تەمەنێکدا کە ناتوانێت هەستەکانی کۆنترۆڵ بکات، هەروەها هاوڕێیەتیی کەسانێک کە مەیلی ئەو حاڵەتەیان هەیە و گۆڕینەوەی باسوخواسی سێکسی لەگەڵیاندا؛ هەریەک لەوانە بۆخۆی جۆرێکە لە دەستدرێژی.

هاوکات تەماشاکردن و خوێندنەوەی ئەو فیلم و ڕۆمانانەی کە هەستی هاوڕەگەزخوازی دەورووژێنن، ڕێخۆشکەرن بۆ سەرهەڵدانی ئەو جۆرە هەستانە.

فاکتەرێکی تریش ئەوەیە، ئەو کوڕە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ کچدا بووە و مۆدێلی کوڕانەی نەبینیوە.

> **تەماشاکردن و خوێندنەوەی ئەو فیلم و ڕۆمانانەی کە هەستی هاوڕەگەزخوازی دەورووژێنن، ڕێخۆشکەرن بۆ سەرهەڵدانی ئەو جۆرە هەستانە.**

هەڕەشەوگوڕەشە لەگەڵ ئەو جۆرە منداڵانەدا بێهوودەیە. چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە بە ترساندن و چاوسوورکردنەوە نابێت، بەوە دەبێت هەنگاوبەهەنگاو فێری بکەین چۆن هەستەکانی کۆنترۆڵ بکات.

مەرجی یەکەمی ئەوەش بریتییە لە دوورخستنەوەی ئەو منداڵە لەو فاکتەرانەی کەوتووەتە ژێر کاریگەرییانەوە. ڕێنمایی دەکەین بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت لە هاوڕێیەتیی هاوشێوەکانی و تەماشاکردنی ئەو فیلم و گرتانەی کە ئەو هەستانەی تێدا دەبزوێنن.

جێگۆڕکێیش یارمەتیدەرێکی باشە، تاکو منداڵەکە بێتەوە سەرخۆی. ئەمە جگە لەوەی بەهێزکردنی پەیوەندیی باوان-منداڵ و گۆڕانی ئەو پەیوەندییە بۆ خۆشەویستیی بێ مەرج، کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە سەر بنەبڕکردنی ئەو حاڵەتە ناتەندروستە.

> **جێگۆڕکێ یارمەتیدەرێکی باشە، تاکو منداڵ بێتەوە سەرخۆی.**

ئەگەر هیچ کام لەوانە سوودی نەبوو، ئەوکات دەتوانین پشت بە ئەزموونی کەسانی پسپۆڕ ببەستین.

## ڕەفتارمان چۆن بێت لەگەڵ ئەو منداڵەی دەڵێت: "کە گەورە بووم، شوو دەکەم بە براکەم"؟

هەندێك جار منداڵان بە هۆی لاوازیی گەنجینەی وشەکانیان و ڕانەهاتنیان لە سەر دەربڕینی هەستەکانیان، بەهەڵە ڕستەکانیان دادەڕێژن.

ئەوەیش کە منداڵ دەڵێت: "کە گەورە بووم، شوو دەکەم بە براکەم"، هەروەک ئەوە وایە. لەوانەیە (شووکردن) بە لای ئەوەوە، واتای (زۆر خۆشویستن و پێکەوەژیان) بگەیەنێت.

نابێت دایکان و باوکان بەو ڕستانە بکەونە دڵەڕاوکەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت بزە بیانگرێت. هەروەها دەبێت هەست بە کەموکورتیی زمانەوانیی منداڵەکەیان بکەن و لە کاتی جیاجیادا وشەی تازەی فێر بکەن.

منداڵ، خۆیشی و بیرکردنەوەکانیشی و داواکارییەکانیشی پاک و بێمەبەستن.

لەو حاڵەتانەدا دەتوانین پێی بڵێین: "خوشک و برا شوو ناکەن بە یەکتری، بەڵام یەکتریان زۆر خۆش دەوێت. خۆشەویستیی نێوانیان وەک خوشک و برا، لە هەموو جۆرە خۆشەویستییەکی تر تایبەتترە."

لەو ڕووەوە هیچ پێویست بە ڕووگرژکردن و بێتاقەتی ناکات، دەبێت بە ئاماژەی ڕووخساریش بێت ئەو پەیامە نەدەین کە منداڵەکە شتێکی بێمانای وتووە.

> **دەبێت وشەی نوێ فێری منداڵەکانمان بکەین، تاکو بتوانن هەستەکانیان بە شێوەیەکی دروست دەربڕن. پێویستە واتای وشەی (هاوسەرگیری)ی بۆ ڕاست بکەینەوە.**

## چی بڵێین بەو منداڵەی کە بە دایك و باوکی دەڵێت: "من دەمەوێت لەگەڵ ئێوە هاوسەرگیری بکەم"؟

کاتێك منداڵ بە دایک و باوکی دەڵێت هاوسەرگیریتان لەگەڵدا دەکەم، ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت کە خۆشی دەوێن و نایەوێت لێیان جیا بێتەوە.

یان لەوانەیە بیەوێت ئەویش خۆشەویستییەکی لەو جۆرە بەدەست بهێنێت، کە لە نێوان دایک و باوکیدایە. بە واتایەکی تر؛ داواکردنی خۆشەویستییەکی باشتر و زیاترە.

لەم حاڵەتانەدا، ئەرکی دایک و باوکە فێری بکەن چۆن بە زمانێکی دروست خۆشەویستیی خۆی بۆ باوانی دەربڕێت، هەروەها پێویستە دڵنیا بکرێتەوە لەوەی کە ئەوان هەتاهەتایە وەک دایک و باوکی ئەو دەمێننەوە.

**کاتێك منداڵ داوای ئەوە دەکات هاوسەرگیری لەگەڵ دایک و باوکیدا بکات، مانای وایە دەیەوێت لێیان جیا نەبێتەوە.**

دەتوانرێت پێی بوترێت: "وەک کچ و باوک دەتوانین یەکترمان زۆر خۆش بوێت، پێویست بە هاوسەرگیری ناکات. ئەوەتا من هاوسەری دایکتم، تۆم زۆر خۆش دەوێت."

## چۆن وەڵامی ئەو منداڵە بدەینەوە کە پێداگری دەکات و دەڵێت: "من هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم"؟

هەندێك جار منداڵان لەبەر هۆکارێک لە هۆکارەکان، ئەوە بۆ دایک و باوکیان دەردەبڕن کە نایانەوێت هاوسەرگیری بکەن، تەنانەت لەوانەیە جنێویشی پێ بدەن، چونکە وا دەزانن ئەنجامدانی هاوسەرگیری، واتە دوورکەوتنەوە لە باوان، ئەمە تا بڵێی حاڵەتێکی ئاسایی منداڵییە.

لە هەرزەکارییشدا لەوانەیە بە هۆی بیرکردنەوەیان لە سەختی و گرانیی هاوسەرگیری، یان بینینی نموونەی نەرێنی، ئەو جۆرە قسانە بکەن. هۆکارەکەی هەرچییەک بێت، نابێت بکەوینە عینادی لەگەڵیدا و هەوڵ بدەین قەناعەتی پێ بهێنین کە "پێویستە لەسەری هاوسەرگیری بکات".

ئاخر پاڵنەری هاوسەرگیری؛ سۆزدارییە، نەوەک بیرکردنەوە و لێکدانەوەی مەنتیقی.

> **پاڵنەری هاوسەرگیری؛ سۆزدارییە، نەوەک بیرکردنەوە و لێکدانەوەی مەنتیقی.**

ئەو منداڵەی هێشتا نەگەیشتووەتە تەمەنی ئەوەی پەیوەندیی سۆزداری لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا ببەستێت، ئاساییە وا بیر بکاتەوە و باوەڕی بەوە بێت هاوسەرگیری نەکات.

## چی بکەین ئەگەر منداڵێکی هەرزەکار ویستی شووبکات یان ژن بهێنێت؟

بۆ ئەوەی کەسێک هاوسەرگیری ئەنجام بدات، چوار مەرج هەیە پێویستە تێیدا دەستەبەر ببێت:

**١. مەرجی یاسایی**

پێش هەموو شتێک، پێویستە منداڵ گەیشتبێتە تەمەنی یاسایی هاوسەرگیری، ئەو تەمەنەش بریتییە لە ١٨ ساڵی. ئەگەر منداڵی خوار تەمەن ١٨ ساڵ خواستی خۆی بۆ هاوسەرگیری دەربڕی، دەتوانین پێی بڵێین کە یاسا ڕێگە بەو کارە نادات.

**٢. مەرجی فیسیۆلۆژی**

وێڕای دەستەبەربوونی مەرجی یاسایی، هاوکات پێویستە لە ڕووی توانا و لێهاتنی جەستەییشەوە شیاوی ئەوە بێت ببێتە هاوسەر، ئەم تەمەنە لە ڕووی پێدەگۆژییەوە بریتییە لە ٢١ساڵی.

> **هەر هاوسەرگیرییەک ئەم مەرجەی تێدا نەبێت، دەبێتە مۆڵگەی گرفت بۆ هەردوو لا و ژن و مێرد تووشی چەندین کێشەی دەروونی دەبن.**

**٣. مەرجی عاتیفی**

هاودەم لەگەڵ مەرجی جەستەییشدا، ئەو کەسەی خوازیاری هاوسەرگیرییە، دەبێت توانای هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان و هاوسۆزی و دەربڕینی خۆشەویستی و ئەو لایەنە سۆزدارییانەی هەبێت. هەر هاوسەرگیرییەک ئەم مەرجەی تێدا دەستەبەر نەبێت، دەبێتە مۆڵگەی گرفت بۆ هەردوو لا و ژن و مێرد تووشی چەندین کێشەی دەروونی دەبن.

> **قۆناغی هەرزەکاری، تەمەنی ئەنجامدانی هاوسەرگیری نییە.**

**٤. مەرجی زیهنی**

بەبێ بوونی ئەم مەرجە، ئەنجامدانی هاوسەرگیری بە کارێکی دروست دانانرێت، ئەگەرچی هەموو مەرجەکانی سەرەوەش دەستەبەر بن. بۆ نموونە؛ ئەگەر کەسێک وێڕای هاوسەرداریيشی، هێشتا هەروەک زگورت هەڵسوکەوت بکات و نەزانێت لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا چۆن مامەڵە لەگەڵ هاوژینەکەیدا بکات، یان وا بڕوانێتە هاوسەرداری وەک ئەوەی تەنها پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی خۆی بێت، بەڵگەی ئەوەیە هێشتا ئەو کەسە نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی شیاوی هاوسەرگیری بێت.

کاتێک چاو دەخشێنینەوە بەو مەرجانەی سەرەوەدا، بۆمان دەردەکەوێت کە هەرزەکاری تەمەنی ژنهێنان یان شووکردن نییە.

## ئایا دەستلێدانی ئەندامی زاووزێی منداڵ لە کاتی پشکنینی پزیشکی و چارەسەردا، زیان بە مەحرەمیەتی منداڵ دەگەیەنێت؟

چ لە چارەسەرکردنی منداڵدا بێت یان کەسی پێگەیشتوو، پێویستە زۆر بەوردی ئەو پزیشک و دەروونناسانە هەڵبژێرین کە خۆمان دەخەینە بەردەستیان، وا باشە زووزوو نەیگۆڕین.

بۆ نموونە؛ ئەگەر منداڵ سەردانی پزیشکی ددان بکات، ئەوا ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ پزیشکدا دروستی دەکات، دەبێتە هۆی ئەوەی ترسی بشکێت. بەپێچەوانەشەوە، گۆڕینی پزیشک، منداڵ تووشی دڵەڕاوکە دەکات.

هاوشێوەی ئەمە، ئەگەر بەردەوام بچێت بۆ لای هەمان پزیشک و هەر ئەو پزیشکەش پشکنینی بۆ ئەنجام بدات، ئەوا هەم مەحرەمیەتی پارێزراو دەبێت، هەم تووشی دڵەڕاوکەش نابێت.

**"دەبێت بەوریاییەوە ئەو کەسانە هەڵبژێردرێن، کە مامەڵە لەگەڵ ژیانی کەسیی منداڵەکانماندا دەکەن."**

**زۆر جار دایکان و باوکان لەپێناو پاراستنی منداڵەکانیان لە دەستدرێژی، فێری ئەوەیان دەکەن بقیژێنن، ئایا ئەوە کارێکی دروستە؟**

نەخێر، کارێکی دروست نییە.

چونکە ئامۆژگارییەکی لەو جۆرە، زیان بە (کاردانەوەی سروشتی)ی منداڵ دەگەیەنێت.

ئاشکرایە کاردانەوەی منداڵان بەرامبەر حاڵەتە نائاساییەکان، جیاوازە. منداڵی وا هەیە ئەگەر دەستی بۆ ببردرێت؛ گاز دەگرێت، هی واش هەیە دەست و قاچ دەوەشێنێت، هەندێکیش دەکەونە هاوارکردن و تفکردن. ئەو منداڵەی بە گەستن پارێزگاری لە خۆی دەکات، ئەگەر پێی بوترێت لەبری گازگرتن هاوار بکات، یان ئەو منداڵەی بە پەلهاویشتن خۆی دەپارێزێت، پێی بوترێت تف بکات، ئەوەیش کە شێوازی بەرگرییەکەی هاوارکردنە، ئامۆژگاری بکرێت بە هەڵهاتن، ئەوا کارێک دەکەین سیستمی خۆپارێزیی سروشتی هەموویان پەک دەخەین. ئەو هەڵسوکەوتانەی منداڵ بۆ خۆپاراستن پەنایان بۆ دەبات، کاردانەوەی سروشتین، واتە بێ بیرلێکردنەوە ئەنجامیان دەدات.

> **باشترین قەڵغان بۆ پاراستنی منداڵ لە دەستدرێژی، بریتییە لەوەی هەست بە بەرێزیی خۆی بکات و ئەوەندە سەربەست بێت کە بتوانێت تووڕەییەکەی بەکاربهێنێت.**

بۆ ئەوەی منداڵ هەستی تووڕەیی بەئازادی دەرببڕێت، دەتوانین کەشێکی ئاسوودەی بۆ فەراهەم بهێنین. بە جۆرێک کە تووڕە بوو؛ بتوانێت هاوار بکات، یان کە لە شتێک پەست بوو؛ بتوانێت بکێشێت بە شتێکدا. بەڵام

ختکردنەوە لە سەر هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو، دەبێتە هۆی ووردارکردن و کوێرکردنەوەی کاردانەوە سروشتییەکانی.

چاکترین پارێزەری منداڵ لە دەستدرێژی ئەوەیە، ڕێگە بدەین لە کاتی توورەیی و پەستیدا هەستەکانی دەرببڕێت، چونکە ئەوانە گەورەترین چەکی خۆپارێزی سروشتین.

چاکترین پارێزەری منداڵ لە دەستدرێژی ئەوەیە، ڕێگە بدەین لە کاتی توورەیی و پەستیدا هەستەکانی دەرببڕێت، چونکە ئەوانە گەورەترین چەکی خۆپارێزی سروشتین.

لە لایەکی ترەوە، هەر منداڵێک لە کاتی پەروەردەکردنیدا ڕێزی لێ گیرابێت، بەرامبەر هیچ ڕەفتارێکی خاڵی لە ئەدەب و ڕێز خۆی پێناگیرێت و پێی قبوڵ ناکرێت. بۆیە ئەگەر دەمانەوێت ڕۆڵەکانمان لە دەستی چەپەڵی کەسانی ناپاک پارێزراو بن، ئەوا دەبێت بە شێوەیەک لەگەڵیاندا بجوولێینەوە، هەست بە ڕێزداریی خۆیان بکەن.

لە بیرمان نەچێت، ئەو منداڵانەی لە دۆخی دژواردا هاوار ناکەن، ئەوانە نین کە فێری هاوارکردن نەکراون، بەڵکو ئەوانەن کە لەلایەن باوانیانەوە فشاریان خراوەتە سەر و ڕێگەیان پێ نەدراوە هەستەکانیان دەربڕن.

ئەو منداڵانەی لە دۆخی دژواردا هاوار ناکەن، ئەوانە نین کە فێری هاوارکردن نەکراون، بەڵکو ئەوانەن کە لە لایەن باوانیانەوە فشاریان خراوەتە سەر و ڕێگەیان پێ نەدراوە هەستەکانیان دەربڕن.

## ئایا ڕاستە تەنیا کچان ڕووبەڕووی دەستدرێژی دەبنەوە؟

نەخێر، ڕاست نییە.

بەهەڵەدا چوویت ئەگەر وا بیر بکەیتەوە: "منداڵەکەی من کوڕە، دەستدرێژیی ناکرێتە سەر"، کوڕانیش هەروەک کچان ئەگەری دەستدرێژیکرانە سەریان هەیە. ئامارەکانی لاقە و دەستدرێژی هەرچەندە ڕەنگدانەوەی واقیعیش نەبن، بەڵام ڕێژەیەکی بەرچاوی ئەو منداڵانەی دەستدرێژی دەکرێتە سەریان لە کوڕانن.

دەستدرێژی تەنیا لادانی سێکسی ناگرێتەوە، بەڵکو حاڵەتێکە لە دەرئەنجامی توندوتیژییشەوە سەر هەڵدەدات، هەر بۆیە کوڕانیش هەمان مەترسیی کچانیان لەسەرە.

> ڕێژەیەکی بەرچاوی ئەو منداڵانەی دەستدرێژی دەکرێتە سەریان، کورن.

کچ بێت یان کوڕ، باشترین ڕێگەچارەی خۆپاراستن بریتییە لە جێگیربوونی چەمکی مەحرەمیەت لە ناو خێزانەکانماندا.

## مەترسیدارترین تەمەن بۆ دەستدرێژی، چ تەمەنێکە؟

تەمەنی(٦-٧) ساڵی لە ڕووانگەی دەستدرێژیی سێکسییەوە، بە مەترسیدارترین تەمەن دادەنرێت.

> تەمەنی (٦-٧) ساڵی لە ڕووانگەی دەستدرێژیی سێکسییەوە، بە مەترسیدارترین تەمەن دادەنرێت.

منداڵانی سەر بەم تەمەنە ناچن ئەو شتە بگێڕنەوە بۆ خێزانەکانیان کە بەسەریاندا هاتووە، چونکە بەتەواوەتی نازانن چی ڕووی

داوە، بەڵام دەزانن کە شتێکی باش نەبووە.

ڕوویەکی دیکەی مەترسیداربوونی ئەم تەمەنە ئەوەیە، بێئاگان لە نەواختی ئەو تاوانەی بەرامبەریان کراوە.

## ئەگەر کەسێك بەمنداڵی دەستدرێژیی کرابێتە سەر، لە گەورەییدا گرفتاری چ جۆرە گرفتێکی سێکسی دەبێت؟

منداڵ کچ بێت یان کوڕ کاتێك تووشی دەستدرێژی دەبێتەوە، سەرەتا هەست بە سووکایەتی دەکات، تا دواتر ئەو هەستە دەگۆڕێت بۆ هەستی بێنرخی و خۆبەکەمزانین.

منداڵ بەتەنیا خۆی توانای ساڕێژکردنی ئەو برینەی نییە کە دەستدرێژی تێیدا دروستی کردووە، لەولاشەوە دایک و باوکیش هێندەی منداڵەکەیان لە ژێر کاریگەریی حاڵەتەکەدان، بۆیە زۆر زەحمەتە ئەوانیش بتوانن هاوکاریی منداڵەکەیان بکەن. لەبەر ئەوە باشترین چارەسەر، پەنابردنە بەر کەسی پسپۆڕە.

> **دیارترین شوێنەواری دەستدرێژی، بریتییە لە هەستی خۆبەکەمزانین.**

شپرزەیی ناسنامەی سێکسی و ڕقوکینە و نەفرین؛ لە نموونەی ئەو دەرهاویشتە سێکسییانەن کە ئەگەری هەیە کوڕان لە ژیانی داهاتوویاندا گیرۆدەی ببن. ترسان لە سەرجێیی و دوودڵی و خۆبەکەمزانینیش؛ هەندێکن لەو دەرهاویشتە نەرێنییانەی کە ئەگەری هەیە لە کچاندا سەر هەڵبدات.

## خێزان چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵێکدا بکات، کە ڕووبەڕووی دەستدرێژی بووەتەوە؟

دایکان و باوکان مەرگی ڕۆڵەکانیان بە ئازاربەخشترین کارەساتی دونیا وەسف دەکەن. بەدوای ئەویشدا خێرا باس لە دەستدرێژیکرانە سەر منداڵەکانیان دەکەن.

تاوانی دەستدرێژی، مەترسییەکەی لەوەدایە کە هاوسەنگی و ڕەوتی سەرجەم ئەندامانی خێزان تێک دەدات.



**ئەو خێزانەی منداڵەکەیان دەستدرێژی کراوەتە سەر، باشتر وایە هەموویان چارەسەری دەروونی وەربگرن.**



بۆ نموونە؛ ئەو دایک و باوکەی جگەرگۆشەکەیان بووەتە قوربانیی تاوانی دەستدرێژی، ڕەنگە ساردوسڕی بکەوێتە پەیوەندیی سێکسییانەوە و وەک کاردانەوەیەک بێزی لێ بکەنەوە.

تەنانەت خزمە پلە یەکەکانیش دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو ڕووداوە نەخوازراوەوە، بۆیە وا باشە ئەوانیش چارەسەری دەروونی وەربگرن.

## هەڵسوکەوتمان چۆن بێت لەگەڵ ئەو منداڵەدا، کە باسی ئەوەمان بۆ دەکات دەستدرێژی کراوەتە سەر؟

زۆربەی جار منداڵ ڕووبەڕووی مامەڵەی وا دەبێتەوە، کە چەندین قات لە خودی ڕووداوی دەستدرێژییەکە کارەساتبارترە، ئەویش بە بەکارهێنانی ڕێگەی نازانستییانە لە کاتی لێپێچینەوە و پرسیارلێکردنی سەبارەت بە ڕووداوەکە.

جاری وایە بە دەستی خۆمان ئازار و تاڵاوی دەستدرێژییەکە ئەوەندەی تر زیاد دەکەین، ئەویش بە پرسیارکردن لە وردەکاری و چەندوچوون و شێوازی ڕووداوەکە. خراپیی ئەمە لە کوێدایە؟ پێکهاتەی ڕۆحیی مرۆڤ بە جۆرێک دروست کراوە، ئەو ڕووداو و بەسەرهاتە ناخۆشانە هەڵبداتە عەقڵی ناخودئاگاوە کە ئازاری دەروونی مرۆڤ دەدەن، ئیتر بەو شێوەیە کەسەکە وردەکارییەکانی لەیاد نامێنێت. بەڵام کە ئێمە ئەوەندە پرسیاری لێ دەکەین و دەیهێنین و دەیبەین، ئیدی ئەو وردەکارییە لەبیرکراوانە دێنەوە عەقڵی ئاگا و ئەوەندەی تر زامەکان دەکولێننەوە.

دایک و باوک هیچ سوودێک نابینن لەوەی وردەکاریی ڕووداوەکە بزانن.

بڕی ئەو زیانەی بە منداڵەکە گەیشتووە، لە ڕێگەی شێوازی زانستییەوە دیاری دەکرێت، بێ ئەوەی ئەو منداڵە هیچ ئازارێکی تازە بچێژێت. بڕی ئەو زیانەی پێی گەیشتووە، پێمان دەڵێت چ ڕێوشوێنێک بگرینە بەر بۆ چارەسەر. هەموو ئەمانە ئەگەر لە ژێر چاودێریی کەسانی شارەزادا بێت، زیانەکان دادەبەزن بۆ کەمترین ئاست.

ئەوجا هەموو دەزانین کە منداڵ تەمەنێک لەگەڵ دایک و باوکیدا دەباتە سەر، بۆیە ئەگەر لەلایەن دایک و باوکیەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت، ئەگەری ئەوە هەیە هەموو ساتێک کە لەگەڵ ئەواندا بەسەری دەبات، ئەو یادەوەرییە تاڵەی بیر بخاتەوە.

> **ڕووداوی دەستدرێژی بە هاوکاریی کەسانی پسپۆڕ چارەسەر دەکرێت.**

## پێڕست

ڕەنــگە ئەو وەڵامەی ســەرەوە بــۆ هەنــدێک منــداڵ بەس بێــت، بەڵام هەندێکی تریان بەپەرۆشەوە درێژە دەدەن بە زنجیرەی پرسیارەکانیان: "ئایا پزیشــکەکان ســکت هەڵــدەدڕن؟ ئەی ئــازاری نایەت؟..."



**زانیاریی گشتی دەدرێت بەو منداڵەی پرسیاری چۆنێتیی منداڵبوون دەکات، نەک وردەکارییەکانی.**



بە هەمــان شــێوە، بــۆ وەڵامــی ئەو جــۆرە پرسیارانەش ناچینە ناو وردەکارییەوە. دەتــوانین بڵێــین: "لەوانەیە کەمێــك ئــازاری بێــت، بەڵام خۆشیی لەدایکبــوونی خوشــکەکەت، شــایانی هەموو شتێکە..."

## وەڵامــی ئەو منــداڵە چییە کە دەپرســێت: "بــۆچی مــن لە باوکم دەچم؟"

منداڵ لەبەر ئەوەی لە سکی دایکیەوە هاتووتە دونیا، ڕەنگە لەوە تێبگــات بۆچی لە دایکی دەچێت، بەڵام بەزەحمەت لەوە تێــدەگات بــۆچی لە بــاوکی دەچێت، بۆیە زۆرێک لە منداڵان دایک و باوکیــان بەگیــر دەهێــنن و پرســیار دەکەن بۆچی لە باوکیان دەچن.

وەڵامدانەوەی زانستییانەی ئەو جۆرە پرسیارانە بێهــوودەیە، پێویســت بەوە ناکات باسی هۆکاری بۆماوەیی و دابەشبوونی خانەکانی بۆ بکەین، ئەو چــاوەڕێی وەڵامێکــی ڕوون و پوختە. وەڵامێکــی سادەوســاکاری لەم جــۆرە، ڕەنــگە لە جێــی خۆیــدا بێــت: "لەبەر ئەوەی مــن بــابە گیــانتم زۆر خــۆش دەوێــت، تۆش لەبەر ئەوە چوویتەوە سەر ئەو."



**منداڵ حەزی لە وەڵامی سادەوساکارە، نەک ڕوونکردنەوەی قووڵ و فەلسەفییانە.**



# هەنگاو بەهەنگاو پەروەردەی سێکسی منداڵ

لەم بەرهەمەدا پرسیارگەلێك وەڵام دەدرێنەوە کە لای خێزان و پەروەرشیاران دروست دەبن، بەشێك لەو پرسیارانەش:

- ئایا ڕوونکردنەوەی بابەتە سێکسییەکان بۆ کۆمەڵێک منداڵ لە پۆلێکدا تاچەند گونجاوە؟
- پاککردنەوەی ئەندامی زاوزێی منداڵ لە لایەن دایک و باوکەوە، تا تەمەنی چەند ساڵی دروستە؟
- ئایا خووی دەستپەڕ بە هۆکاری بۆماوەیی، لە دایک و باوکەوە دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ؟
- چی بکرێت باشە ئەگەر منداڵ، دایک و باوکی بەڕووتی بینی؟
- ئایا منداڵ دەتوانێت لای خزمەکانی بخەوێت؟
- چۆن وەڵامی ئەو منداڵە بدەینەوە کە دەپرسێت: "من چۆن لەدایک بووم؟"
- ئایا دیمەنی عەشق و خۆشەویستیی ناو فیلم و زنجیرە دراماکان، کاریگەریی خراپیان هەیە لە سەر گەشەی منداڵەکانمان؟
- ئایا پێویست دەکات پێشتر زانیاری بدەین بە کورو کچەکانمان سەبارەت بەو گۆڕانکارییە عاتیفییانەی کە لەگەڵ پێنانە ناو قۆناغی هەرزەکاریدا بەسەریاندا دێت؟
- ئایا هاوڕێیەتی نێوان کچ و کوڕ لە قۆناغی قوتابخانەدا ئاساییە؟ دەتوانین بڵێین بناغەی ئەو پەیوەندییە، پاڵنەری سێکسییە؟
- چۆن مامەڵە بکەین، ئەگەر بۆمان دەرکەوت منداڵەکەمان خووی گرتووە بە سەیرکردنی فیلمی سێکسییەوە؟
- چی بکەین بۆ کەمکردنەوەی زیانی ئەو زانیارییە سێکسیانەی کە منداڵ پێشوەختە دەستی کەوتووە؟
- چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵێك دەکەین، کە حەزی لە نزیکبوونەوەی سۆزدارییە لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا؟
- مەترسیدارترین تەمەن بۆ دەستدرێژی، چ تەمەنێکە؟
- هەڵسوکەوتمان چۆن بێت لەگەڵ ئەو منداڵەدا، کە باسی ئەوەمان بۆ دەکات دەستدرێژی کراوەتە سەر؟


ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA MEDIA CENTER

www.aramediacenter.com

info@aramediacenter.com

facebook.com/ aramediacenter

instagram/ ara_media_center







0-0512-0000-7

9 780051 200000

نرخی (٥٠٠٠) دینارە